خاوێر کریمێنت

# بێ شعوری

## ناسین و چارەسەرکردنی
## مەترسیدارترین نەخۆشی مێژووی مرۆڤایەتی



وەرگێڕانی: ئەمجەد عوسمانی

خاوییێر کرێمێنت

# بێشعووری

وەرگێڕانی:

ئەمجەد عوسمانی

# بێشعوری


- نوسەر: خاوێر کرێمێنت
- وەرگێڕ: ئەمجەد عوسمانی
- پیتچنین: ڕەحیم شاسەنەم
- پەڕبەندی: محمد ئەمین شاسەنەم
- بەرگ: دانیارعەتا
- هەڵەچن: هومایۆن صاحب - دانیارعەتا
- نۆبەو ساڵی چاپ: یەکەم ٢٠١٦
- چاپخانە: هێڤی
- ژمارەی سپاردن: ٤٨٥

بلاوکراوەی کتێبخانەی هەژارموکریانی

سەرپەرشتی چاپ: عەتا ڕەووف

٠٧٥٠١١٧٣٩٢١

# ناوەرۆك

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەرێ تووڕە نابن کاتێك دراوسێکەتان زبلەکان دەخاتە قاناوەکەوە؟ داخوا بۆ وەرگرتنی واژۆیەك چەند ڕۆژ هات وچۆی ئیدارەتان کردووە؟ داخوا هەستتان بەوە کردووە کە بەڕێوەبەری ئیدارە ڕێزیتان پێ دەکا؟ داخوا بە دڵتاندا هاتووە سەندەڵییەك بە سەری پزیشکەکە دادەن، لەبەرئەوەی دوای ئەو هەمووە ڕاوەستانە و دانی پارەی ویزیت، بەبێ ئەوەی سەبارەت بە نەخۆشییەکەتان بپرسێ دەستبکا بە نووسخە نووسین؟ ئاخۆ بە بینینی بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن تووڕە نابن؟ داخوا قەت بە مێشکتاندا نەهاتووە گەورەی بنەماڵە بخنکێنن لە بەر ئەوەی بەردەوام خەریکی فزوولی و ئامۆژگاری و سەروەرییە؟ داخوا دەستەویەخەی هاوکارێك بوون کە خۆی لەکار دەدزێتەوە یان دەیهەوێ کەسێك لە پلە و پایە بخات؟ داخوا هەڤاڵەکانتان بۆ کاروباری بازرگانی و ئایینی هانتان دەدەن؟ لەگەڵ خێزانتان چۆنن؟ بیرت لە جودابوونەوە کردۆتەوە یان ئەوەندە بێحەیایە کە ناوێری باسی جودابوونەوە بکەی؟ منداڵی بەدفەڕیشتان هەیە و لەناو خەڵکدا سەرشۆڕی کردوون؟

ئەگەر وڵامی ئەو پرسیارانە پۆزتیڤە، ئەوا ئەو کتێبە بۆ ئێوەیە. چونکە لەگەڵ بێ شعوورەکان سەروکارتان هەیە و ڕێنوێنیەکی زانستیە بۆ ناسینی و چارەسەرکردنی بێشعووری کە مەترسیدارترین نەخۆشی مێژووییە و چۆنیەتی هەڵس وکەوت لەگەڵ ئەوان تاوتوێ دەکا. ئەگەر وەڵامەکان

نەرێنی بن ئەوا لە بارودۆخێکی نالەباردان و لەوانەیە تووشی نەخۆشییەکی مەترسیدارتر بن.

وێدەچێ بێشعووری نەخۆشی بێ و دەبێ وەکوو تەواوی نەخۆشییەکان بۆ بەرگری و چارەسەری بیناسین.

بێ شعووری کوشندەترین نەخۆشی مێژوویی و مرۆڤایەتیە کە تا ئێستا ڕێگەچارەی زانستی بۆ نەدۆزراوەتەوە. بێشعووری کەریەتی نییە و نەتەنیا گەوج نین، بەڵکوو لەحاند خەڵکی ئاساییدا توانایی و لێهاتوویان پترە. لەخۆبایی، بێحەیایی و بە ئاگاییەوە دەستڕێژی کردن بۆ مافی خەڵك (کە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی بێشعوورە) زیاتر لەلایەن ئەو کەسانەوە بەڕێوە دەچێ کە لە بواری بیر، زانیاری، پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ماڵیدا لە بارودۆخێکی باشدان و ئەگەر لە خەڵك باشتر نەبن، خراپتر نین.

پزیشکێك کە ناهێڵێ نەخۆشەکەی بیرو بۆچوونی خۆی دەربڕێ یان سیاسەت مەدارێك کە بەدانی بەڵێنی پڕوپووچ و لێکدانەوە و ڕاگەیاندنی درۆ خەڵك فریو دەدا، هیچکام لەوانە گەوج و گەمژە نین. هەروەها هاووڵاتییەك کە زبڵەکەی لە قاناوی کۆڵانەکەیان دەڕێژێ، جوداوازی سەتڵی زبڵ و قاناو دەزانێ.

بێگومان هۆکاری ئەو زەرەر و زیانانەی کە بە درێژایی مێژوو لە مرۆڤەکان کەوتووە بێشعوورەکان بوون نەك مرۆڤە نەزانەکان. ئەو بێ شعوورانەی لە مێژوودا جەنایەتیان کردووە زۆربەیان مرۆڤێکی زیرەك و

تێکۆشەر بوون کە هەرچەند خاوەنی توانایی و لێهاتووی پوزتیڤ بوون بەڵام بە خۆبایی. دەستڕێژی بۆ مافی خەڵك و ئاکاری نەرێنی، بێشعوورییەکی گەورە و مەترسیداریان لە خۆیان دروست کردووە کە دنیایان لەبەین بردووە.

لە دنیای مۆدێرندا و بە بەرزبوونەوەی ئاستی زانیاری و فێرکاری، بە پاڵپشتی ئەم بیرۆکە نادروستە کە زانیاری و تێگەیشتوویی، ئاسایش و فەرهەنگی گشتی بەدواوەیە، بێ شعوورەکان زۆرتر بوون. بە چاوخشاندنێك بەسەر خاوەنبیران و تەنانەت مرۆڤ کووژەکان کە لە زانکۆکانی جیهاندا پەروەردە بوون و بە هەژماری کووژراوەکان بۆمان دەردەکەوێ کە دنیا پڕە لە بێشعوور، بەڵێ دنیا بەدڵی بێ شعوورەکانە.

خاوێر کرێمێنت ئەم ڕاستییە بەژان و ئازارە دەکاتە بابەتی کتێبە حەنەکاوێکەی خۆی.

# پێشەکی نووسەر

منیش وەك هەموو مرۆڤەکان لەگەڵ بێشعوورەکان سەروکارم بووە، بەڵام زۆرجار بیرم لە چەمك و مانای قەدیمی بێ شعووری کردۆتەوە . منیش بێ شعووریم بە نەخۆشی نەدەزانی و لە دڵی خۆمدا دەمگوت چەشنێك کەمایەسی کەسایەتییە و وردە وردە بۆخۆی چاك دەبێ یان لەبەین دەچێ.

ئێستا چییەتی بێ شعووری دەناسم. بێ شعووری گیرۆدەبوونە وەك گیرۆدەبوون بەمادەی سڕکەر و ئەلکۆل کە کاردانەوەی خراپی بۆ تاك و کۆمەڵگا هەیە. لە هەمووان خراپتر ئەوەیە کە بێشعوورەکان زانیارییان لە سەر بێشعووری خۆیان نییە. هەرچەند ئەم تایبەتمەندییانە لەخۆشمدا دەبینم.

هەمووکەسێك ناتوانێ ئەو کارانەی (خاڵی لاوازو هەڵەکان) لە ژیانیدا ئەنجامی داوە بیگێڕێتەوە و ئاشکرای بکا. ماوەیەکی زۆر لە نووسینی ئەم کتێبە و تەنانەت باسکردنی بابەتەکانی دووریم دەکرد. چونکە پێم خۆش نەبوو خەڵك بزانێ گەمژە و بێشعوورم. بەڵام ئاخری ویژدان. دۆستان و نەخۆشەکانم حاڵیان کردم کە لەمێژە خەڵك زانیویانە بێ شعوورم کەوایە نووسین و نەنووسین وەك یەك وایە. بەڵام لەوانەیە بتوانم بە نووسینی بیرەوەرییەکانم یارمەتییان بدەم بەڵکوو چاك ببنەوە.

ئێستا بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە کە چۆن توانیومە ئەو هەمووە ساڵە بێ شعووربم. وەك بێ شعوورێکی دەرمانکراو هەست بە ئازار و مەینەتی ئەو

بێشعوورانە دەکەم کە ئێستا دەرمان دەکرێن. هیچ مرۆڤێکی بەئاوەز نایهەوێ ئەم قۆناغە تاقی بکاتەوە، بەڵام ڕێی دەرەتانی نییە. ئاخری ڕۆژێك ژیان بەربەرەکانێی لەگەڵ دەکاو دەڵێ: «تۆ بێ شعووری». تۆش ڕەتی دەکەیەوە، شەقێکی تێ‌هەڵدەدەی، جنێوی پێ‌دەدەی، بە سەریدا دەگوڕێنی، لێی دەدەی، دەمەقاڵەی لەگەڵ دەکەی. لە بیر خۆتی دەبەیەوە. بەڵام ژیان ئەوانە نازانێ. پێش ئەوەی لە ناوتان ببا بۆخۆتان، خۆتان لەناو دەبەن یان ئەو لەناوتان دەبا. کەوایە دەبێ ئەو ڕاستییە بدرکێنم کە: بیست ساڵی تەواو بێ‌شعوور بووم! لەو ماوەیەدا خزم و کەسەکانم لە بێ شعووری من ئازاریان چێشتووە و لە خۆمم دوور خستوونەتەوە. تەنانەت نەخۆشەکانیشم لێم بێ‌زار بوون. ئەگەر پێشتر ئەم نەخۆشییەم چارەسەر کردبا، ئەوەندە گەورە نەدەبۆوە.

بەڕای من بۆ ناسینی ئەم نەخۆشییە نابێ بڵێین درەنگە یان زووە. هەروەها بۆ چاك سازی ئاکاری خراپیش کە زیان بە کاروباری بازرگانی دەگەیێنێ و کێشە و هەرا سازدەکا. درەنگ و زووی بۆنییە. بۆخۆم تەمەنم چل ساڵ دەبوو بەڵام هەستم بە بێ شعووری نەدەکرد. منیش وەکوو بێ‌شعوورەکان خۆم بە مرۆڤێکی بەهێز دەزانی و شانازیم بەخۆم دەکرد. لە قۆناغی کۆتایی خوێندەواری دا فێر بووم کە چۆن هەستی دڵ و دەروونم خامۆش بکەم و کاری نارەوا ئەنجام نەدەم و لە سەرەتاوە کپی بکەم. لە سەردەمی ڕێزیدنتی دا فێر بووم کە دەتوانم بە تانەو تەشەر وەڵامی پرسیارەکانم لە پەرستار و نەخۆشەکان وەرگرم و بە دڵی من ڕەفتار بکەن.

جگە لەوانە کاتێك وەك پزیشکێکی پسپۆڕ دەستم بەکار کرد سەبارەت بە مرۆڤی شەڕانی و زیتەو وریا ئەزموونم بەدەست هێنا.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە وامدەزانی ئەم تایبەتمەندییانە خاڵی پۆزتیڤە و نیشانەی بڕوابەخۆیی منە. وەك پزیشکێك. دەبوو لە تەواوی تاقیکارییەکانی دەروونناسیدا بەشداریم کردبا بەڵام کەسایەتییەکی بەهێزم هەیە و لە خۆم ڕادەبینم و پێویستم بەوانە نییە. دەزانم خۆم پەروەردە بکەم، چونکە وردبینم، لە کارەکەمدا لێبڕاو و سوورم، بەدەست خۆمە چبکەم و بۆخۆم، خۆم هەڵدەسەنگێنم. یانی کەس ناتوانێ خۆ لەقەرەم بدا و ئەگەر بیهەوێ دەمدرێژی بکا ئەوا تەمبێی دەکەم. پێشئەوەی دەست بەکاربن و دژی من کارێك ئەنجام بدەن، بەگژیاندا دێم.

ئەو تایبەتمەندییانە زۆریان یارمەتیدام، بەجۆرێك کە وەك پزیشکێکی پسپۆڕ لە بواری پرۆکتۆلۆژی دا سەرکەوتوو بووم. لەگەڵ ژنێکی جوان و لەبار زەماوەندم کرد و دوو منداڵی ژیکەڵەمان هەیە. هەڤاڵەکانم ڕێزی تایبەتیم بۆ دادەنێن و لە نەخۆشخانە و شوێنە پزیشکیەکان بەوپەڕی خۆشەویستییەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکەن و لەناو خەڵکیشدا وەك مرۆڤێکی باش و پسپۆڕ باسیان دەکردم. بەگشتی قەت لە ژیانمدا ئەوەندە بەختەوەر نەبووم.

بەڵام هەمووشتێك بە کەیفی دوکتۆر خاوێر کرێمێنت نەبوو. جاریوابوو بیرم لەوە دەکردەوە کە هاوکارەکانم لێم دەترسێن و هەر لەبەرئەوەش ڕێزم

بۆ دادەنێن، منیش دەمگوت نا ئەوە لە بەر گەورەیی و هەیبەتی منە. کاتێك دەچوومە کۆڕی هەڤاڵەکانم، قسەکانیان دەبڕی و بڵاوەیان دەکرد. کاتێك لە میوانی قسەم دەکرد، چاویان لە عەرزی دەبڕی و هیچیان نەدەگوت. پێیان خۆش نەبوو گوێ بۆ قسەکانم ڕابگرن. بەڵام من دەمگوت نا ئەوە کێشەی خۆیانە.

جارێك هاوسەرم گوتی سورپرایزێکم بۆت هەیە و بەبۆنە ساڵوەگەڕی لەدایكبوونم میوانی سازکرد کە تەنیا شەش کەس بەشداریان کرد و لەو شەش کەسەش سیانیان خێزان و منداڵەکانی خۆم بوون. بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم ئەوانە بەرچاوتەنگن و پێیان ناخۆشە بەو پلەوپایە گەیشتووم. سەبارەت بە هەست و هەڵس وکەوتیان سەرسام بووم بەڵام خۆم نارەحەت نەدەکرد و ئەوانەم بە تایبەتمەندی مرۆڤەکان دەزانی. دواتر حەولمدەدا ئەو شتانە گەورە نەکەمەوە و لە بیری بکەم.

ئاخری ڕۆژێك لە خەو ڕاچڵەکیم. تەنیا جگەرگۆشە و تاقانەکەم دوای چەلەحانێیەکی زۆر گوتی: نامهەوێ بچمە زانکۆ و لە هێزی زەریاییدا نێونووسی دەکەم. کوڕەکەم بەربەرەکانێی لەگەڵ دەکردم! باوەڕم نەدەکرد! لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا کەس نەیدەوێرا تخوونم بکەوێ و بەمشێوەیە وەڵامم بداتەوە. ساڵێك کابرایەك بە قسەی نەکردم کەچی ئێستاش پەشیمانە و زمانی خۆی دەگەزێ.

زۆرم پێ خۆشبوو کوڕەکەشم وەك خۆم بۆ دوکتۆری بخوێنێ، بەڵام لاساری دەکرد و جوابی نەدەدامەوە. بە سەریدا گوڕاندم و گوتم بێتوو لە هێزی

زەریاییدا ناونووسی بکەی کوڕی من نیت. ئەویش توند دەرگاکەی پێوەدا و دەستی بە بۆڵەبۆڵ کرد و بە دایکی گوتبوو کە کارم بە باوکم نییە و پێم خۆشنییە بیبینم و ئاخری بە قسەی خۆی کرد و لە ڕستەی فرۆکەوانی‌دا ناونووسی کرد.

قەت باوەڕم نەدەکرد کوڕەکەم دڵم بشکێنێ. نەمدەزانی چ‌بکەم. دەتگوت لە سەر دنیانیم. بە ناڕەحەتییەوە لە خێزان و کچەکەم پرسی: بۆ هیچ ناڵێن؟ پێم‌وابوو قسەکانم قەبووڵ دەکەن و وەك باوکێکی دڵۆڤان باسم دەکەن و دەڵێن ئەو کوڕە کارێکی گەمژانەی ئەنجام داوە. گوتم: چۆن دڵی‌هات داخوازی من ڕەت بکاتەوە؟

دواتر گوێم لە وڵامی کچەکەم بوو کە سەرسامی کردم. ئەو گوتی: «ئێوە تەنیا خۆتان خۆش‌دەوێ».

بۆ ساتێك حەپەسام. هیوایەکم بە خێزانم بوو کە ئەویش گوتی: کچەکەمان ڕاست دەکا. چەند ساڵە ژیانی هاوبەشمان کۆتایی هاتووە و تکایە ئەمشەو لێرە بڕۆ.

سەرم سووڕ مابوو لە ژیانم‌دا شتی ئاوام بۆ پێش نەهاتبوو. لە ماوەی چەند سەعاتدا کەسایەتی چەندساڵەم لەکیس چوو.

چەند ڕۆژ بیرم لەو بابەتە دەکردەوە لەوانەبوو مێشکم بتەقێ. خۆم بە تاوانبار نەدەزانی و دەمگوت حەقم بەدەستە. کەسێك خەریکە هەڤاڵەکانم لێ دوور دەخاتەوە یان دژی من دنەیان دەدا. ئەگەر بزانم کێیە بەخزمەتی دەگەم.

پێشتر لەگەڵ ئەو کەسانە ڕووبەڕوو بوومەتەوە و دەزانم چۆنیان تەمبێ بکەم. لە ئاوا بارودۆخێکدا تەنیا بە ئیرادە و توانایی خۆم توانیومە کەسایەتی خۆم بپارێزم. هەرچۆنێك بێ ئەم بابەتەش تۆفیرێکی لەگەڵ بابەتەکانی دیکە نییە. گەورەترین نیگەرانی من ئەوەبوو کە بە باوەشێکی ئاواڵاوە بگەڕێمەوە ناو بنەماڵەم. بەڵام تا ئێستا نەمتوانیوە ڕازیان بکەم. بەداخەوە پێیان خۆش نییە چاویان بە چاوم بکەوێ و قسەم لەگەڵ ناکەن. ئاخری بەو قەناعەتە گەیشتم کە پێویستیم بە یارمەتی کەسێکی تر هەیە!

لەگەڵ هەڤاڵێکی دەروونناس ڕاوێژم کرد. هەمووشتێکم بۆ گێڕاوە و لێم پرسی ئەو ناکۆکیانە لە کوێوە سەرچاوە دەگرن و بنەماڵەکەم چییان بەسەر هاتووە. بەڕای تۆ نەخۆشن؟ داوام لێکرد ڕاستییەکەیم پێ بڵێ. چونکە توانای ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەر چەشنە هەواڵێکی ناخۆشم هەیە.

کەمێك ڕاوەستاو گوتی: «نەتەنیا نەخۆش نین بەڵکوو زۆریش باشن». ماوەیەك بیرم لە قسەکانی کردەوە. م م مەبەستت ئەوەیە.... من نەخۆشم؟ نا.... توش نەخۆش نی. تەنیا بێ شعووری.

من کە لەو وڵامە واقم وڕمابوو. بە تووڕەییەوە گوتم: « من نەهاتووم سووکایەتیم پێ بکەی. ئەتۆ ناتوانی گیرو گرفتەکانم چارەسەر بکەی، دەڕۆم و ڕۆیشتم.

شەش مانگ تێپەڕی، دەتگوت لە جەحەندەمدا دەژیم، یان لانی کەم شوێنی کارەکەم وەك جەهەندەمی لێهاتبوو. دڵم بەخۆم دەسووتا و ببوومە قوربانی هێزێکی نەناسراو بەجۆرێك کە خۆشەویستترین کەسم بە شێتی دەزانیم و ئاوڕی لێنەدەدامەوە و زۆربەیان گاڵتەیان پێدەکرم. ڕۆژێك تووڕە بووم و ڕۆژێك نارەحەت، بەڵام قەت وانەبوو شادبم. خەوم لێ نەدەکەوت و لە بارودۆخێکی نالەباردا بووم. دەتگوت لە خزمەت دوژمنێکی ڕەمزاویدام و نازانم نەخۆش و پەرستارەکان چۆن لەگەڵ من هەڵیاندەکرد. بەڕاستی ببوومە مرۆڤێکی لاسارو دڕ.

ئاخری دوانیوەڕۆیەك بەو قەناعەتە گەیشتم کە هیچ دەسەڵاتێکم نەماوە و بۆم دەرکەوت کە قەت هاوسەری ژیانم لەدەستدا نەبووە، بەڵکوو تەنیا لەخۆڕازی بووم و پێموابووە هەموو شتێك هی منە. درکاندنی ئەم ڕاستییە سوکنایی پێ دام بەجۆرێك کە ئەو شەوە بە باشی خەوم لێکەوت.

بۆ سبەینێ، خەریکی دەرمانکردنی نەخۆشێك بووم. لەپڕ لەتەکانی ئەم پازڵە یەکیان گرت و سەبارەت بە خۆم زانیاریم بەدەست هێنا. من بێ شعوورم!

ئەو دەروونناسە سووکایەتی بە من نەکردبوو. دەیهەویست یارمەتیم بدا! دەستبەجێ پەیوەندیم لەگەڵ گرت و سەبارەت بەو ڕەفتارە خراپەی لەگەڵم کردبوو داوای لێبووردنم لێکرد و گوتم دەمهەوێ بتبینمەوە.

دوانیوەڕۆی ئەوڕۆژە چاوم پێی کەوت و دەسبەجێ گوتم:

تۆ ڕاست دەکەی. من بێ شعوورم.

باوێشکی داو گوتی: «هەمووکەس ئەوە دەزانن»

باشە. چۆنی چارەسەر دەکەی؟

چیی دەرمان بکەم؟

بێشعووری من.

گوتی: بێ شعووری نەخۆشی نیە. جۆرێك تایبەتمەندییەو دەرمان ناکرێ.

مەبەستت چییە؟

ئەوە بزانە کە زۆربەی خەڵك بێ شعوورن، تەنیا تۆ ناگرێتەوە. بێ شعووری شتێکە وەك چەپدەستی. دەرمانی نییە.

بە سەرسامییەوە پرسیم: «ئەگەر زانستی دەروونناسی نەتوانێ بێشعووری چارەسەر بکا چ قازانجێکی هەیە؟

بێشعووری نەخۆشییەکی تایبەت نییە. دەروونناسی ناتوانێ مرۆڤی بێ شعوور دەرمان بکا. دەزانی چۆنە ئێمە دەروونناسی بێشعوورمان زۆرە.

ئەوجار لێی حاڵی بووم کە نابێ هیوات بەکەس بێ. بە ڕای من ئەو دەروونناسە چاکی تێنەگەیشتووە و پێموایە بێ شعووری تایبەتمەندییەکی خراپی ڕەفتار نییە. بەڵکوو نەخۆشییە. چەشنێك گیرۆدەییە بە ئاکاری گەمژانە و بێشەرمانە و ئاخری وامان لێ دەکا کە تەنانەت ئاگامان لە خۆبەزل زانینی خۆمان نییە.

من بەرنامەیەکم بۆ دەرمان و چاك بوونەوەی خۆم دارشت کە چەند سالّی خایاند و ئاخری بەئاکام گەیشت. ئەمە لەحالێکدا بوو کە دەروونناسەکە دەیگوت ئەم شتە ئەستەمەو بێشعوورەکان چارەسەر ناکرێن!

ئێستاش داخی ئەوە دەمکووژێ کە بۆچی زووتر ڕەوتی دەرمانکردنم دەست پێ نەکرد هەتا خەڵك ئەوەندە ئازار نەچێژن. هەرچەند توانیم هێندێك لە کارەکانم قەرەبوو بکەمەوە بەجۆرێك کە خێزانم قەبوولّی کرد بگەڕێتەوە و کچەکەشم لەگەلّم ئاشت بۆوە و ئێستا لە زانکۆ دەخوێنێ. کوڕەکەشم فڕۆکەوانی هێزی زەریایە و وانەی هەلّفرینم فێر دەکا.

لەمێژە کۆم ناسیم وێلّ کردووە و ئێستا خەریکی دەرمانکردنی بێشعوورەکانم. هەرچەند تا ئێستا دەروونناسی پشتیوانی لەو کارە نەکردووە. بەلّام کارەکەم برەوی پەیدا کردووە و ئەو دروشمەی من لە هەموو جێگایەك بلّاو بۆتەوە کە «بێشعوورەکان گەشبین و بەهیوابن» ئێستاکە لە کۆنفڕانسەکان دا قسە دەکەم و لەگەلّ ئەو پزیشکانەی لە سەر گیرۆدەکان کار دەکەن، لە پەیوەندی دام.

کتێبی بێ شعووری تەنیا گێڕانەوەی چاك بوونەوەی من نییە و زیاتر باسی بابەتەکە دەکا. دلّخۆشیە بۆ ئەو کەسانەی خوویان بە بێ شعووری گرتووە. نووسراوەیەکی ڕزگاربوونە. ئیدی پێویست ناکا کەس لە بێ شعووربوونی ناهومێد بێ. بێشعووری نەخۆشییەکە وەك نەخۆشییەکانی دیکە کە دەرمان دەکرێ. هەموو بێ شعوورێك دەتوانێ ئەو ڕێگایەی من

تێپەڕ بکاو هەر ئەو ڕێگایەی کە تا ئێستا هەزاران بێ شعوورم ڕێنوێنی کردووەو دەرمانم کردوون.

گەورەترین کەندو کۆسپی ئەم ڕەوتە ئەوەیە کە مرۆڤی بێ‌شعوور بوێری و توانایی ئەوەی هەبێ کە دەست لە نەخۆشییەکە هەڵگرێ و دەرمان‌کەرێکی باش دەرمانی بکا. لەم زەمینەیەدا لە دۆستەکانم بە ناوی کالۆین ئیستابز (بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی دەروونناسی) چیرۆکێکی سەیرو سەمەرەی گێڕاوە. باسی ژنێکی کرد کە بۆ دۆزینەوەی چەمك و مانای ژیان چووبووە کێوەکانی هیمالیا و دوای چەند ساڵ گەڕان، لە ئەشکەوتێکدا چاوی بە کابرایەك دەکەوێ. لەبەرخۆیەوە گوتی: «ئەمە موورتازە و خەریکی موراقیبەیە». لێی نزیك بۆوەو گوتی: «ئەرێ ڕێگای ڕزگاریم نیشان دەدەی؟» ئەو پیاوە هیچی نەگوت.

ژنەکە دانیشت و پەیرەوی لەو پیاوە کرد. لە کۆتایی ئەو ڕۆژە، لێی پرسی: «هیچ فێر بووم؟ پێشڕەوتم هەبووە؟» دیسان وڵامی نەداوە.

سبەینێ گەڕاوە ئەشکەوتەکە و لەلای پیاوەکە دەستی بە موراقیبە کرد و ئێوارێ دیسان ئەو پرسیارەی لێ کردو دووبارە وەڵامی نەداوە.

ئەم ڕەوتە چەند حەوتوو و چەند مانگ دووپات بۆوە. ئاخری ڕۆژێك تاقەتی بەسەرچوو بە سەریدا گوڕاندی: فێڵباز! تۆش مورتازی؟ شەش مانگە چاوەڕوانی ڕزگاریم، هیچ نەقەوماو هیچت فێر نەکردم. دواتر بوخچەکەی بە کابرادا دا. هەرچۆنێك بوو لە جێگای خۆی هەستاو

لەکاتێکدا تلاوتلی دەخوارد گوتی: من مورتاز نیم و ئەو شتانە لە من ناوەشێتەوە. ئەوە تاوانی خۆتە کە پێت وایە مورتازم.

ژنەکە ئەوەندە تووڕە ببوو کە خۆی پێڕانەدەگیراو گوتی: ئەگەر مورتازنیت چ کارەی؟ لێرە چی دەکەی؟ پیاوەکە سەری هەڵێناو گوتی: من گوڵم و لەبەرئەوە دووریان خستوومەتەوە.

ئەگەر بێ شعوورن، یان لەگەڵ بێ شعوورەکان سەروکارتان بێ، ئەوا بە هەڵبژاردنی ئەم کتێبە ڕێنوێنییەکی باشتان هەڵبژاردووە و لانیکەم ڕێگاتان لێ هەڵە نابێ.

## بابەتی یەکەم:

## بەسەرهاتی فرێد

«بێ شعوورەکان تەنیا لە بەر شتێك دەیانهەوێ ئەویندار بن: دەیانهەوێ لە هیچ شتێکدا کەمایەسیان نەبێ. یەك لەوانە ئەوینە».

وینیفرێد . ئەوینداری بەزیوی بێ شعوورێك.

لە ناو تەواوی پیشەکاندا، پیشەی پارێزەری لە هەمووان زیاتر سەروکاری لەگەڵ بێشعوور هەیە. لێرەدا جێیخۆیەتی بەسەرهاتی فرێد لە زمان خۆیەوە ببیستین.

*

لە شوێنی کارەکەم لە سەر سەندەڵییەك پاڵم دابۆوە و ئەوەندە ماندوو بووم کە نەمدەتوانی تا ئێواری خۆم ڕابگرم. سەعات نۆو چارەك بوو. دەتگوت سەعاتیش منی خۆش ناوێ. خەریك بوو بمرم، دەتگوت لەگەڵ دە کەس شەڕم کردووە.

کاتێك لە خەو هەستام شادو خۆشحاڵ بووم، بەلاّم کاتی نانی بەیانی حاڵم تێکچوو. هەموو دەزانن کە بەیانیان چی دەخۆم و هەموو ڕۆژێ ئەو خۆراکانە ڕادەسپێرم: هێلکەی کولاّو کە سێ خولەك کولاّبێ، ژامبۆن . نانی برژاو. ئاوی میوە و قاوە. هەموویان خووخدەی من دەزانن کاتێك دەڵێم هێلکەیەکم دەوێ کە سێ خولەك کولّابێ، یانی دەبێ ڕێك سێ خولەك بێ. ئەو ڕۆژەش وەك ڕۆژەکانی دیکە نان و پێخۆریان بۆهێنام،

بەڵام هێلکەکەیان زۆر کوڵاندبوو. لانیکەم سێ چرکە پتر کوڵابوو! مێگ. خزمەتکاری ڕیستۆرانەکەم بانگکرد و گوتم: هێلکەکەت زۆر کوڵاندووە. بە ناڕاحەتییەوە گوتی: هێلکەیەکی دیکەت بۆ دەکوڵێنمەوە. دواتر بە تووڕەییەوە گوتی: جارێکیدیکە نایکوڵێنم.

پێت خۆشە هەنگوینی بێ. یان زیاتر بکوڵێ؟

گوتم ئەگەر خۆت خوێنتاڵ بکەیو خۆت بنوێنی ئەوە پارەی ئەوڕۆت نادەمێ. دوای پێنج خولەك، سێ جار قاوەکەم پێ گۆڕیو کتری ئاوەکەی بە مندا کرد و گوتی ببوورە نەمزانی بەئەنقەست ئەوکارەم نەکردووە، بەڵام من دەمزانی منداڵ نیم.

هەرچەند خواردنی نانی بەیانی تاڕادەیەك گێروکێشەی بەدواوە بوو، بەڵام لەوە ناخۆشتر ڕۆیشتن بۆ سەرکار بوو. لە شوێنێك کە دەبوو خێراییم سیو پێنج کیلۆمیتر لە سەعاتدا بێ، خێراییم گەیشتە پەنجا کیلۆمیتر لە سەعات و پۆلیس فەرمانی ڕاوەستانی ڕاگەیاند و دووجاری جەریمە کردم. دووهەمیان لە بەر نەبەستنی قایشی هێمنایەتی بوو. منیش تووڕە بووم و گوتم: ئەی بۆ ئەو سەیارەیە جەریمە ناکەی کە خەریكبوو خۆمپێدادا. پۆلیسەکە جریمەکانی لێ وەرگرتم و بڕی جەریمەکانی زیادکرد.

گەیشتمە شوێنی کارەکەم و وەك هەموو ڕۆژێ سەیارەکەم ڕاگرت، بەڵام کاتێك دابەزیم قاچم چووە ناو شیاکەی ئەسپەوە. کەسێك بەدوامەوەیە و دەیهەوێ ئازارم بدا، بەڵام کاتی ئەوەم نەبوو بەدوایدا بگەڕێم. ڕووداوەکە بەردەوامە. هۆدەی کارەکەم لە نهۆمی سەرەوە بوو. بە ئاسانسۆر وەسەر

دەکەوتم، بەڵام ئەوڕۆژە لە مابەین نهۆمی سێهەم و چوارەمدا گرفتار بووم. زۆری نەخایاند کە ئاسانسۆرەکە چاك بۆوە بەڵام گوێم لێبوو کەسێك لە نهۆمی چوارەم دەیگوت: فرێد لە ئاسانسۆردا ماوەتەوە و تازە هیچ ناکرێ و دەبێ تا شەوێ بمێنێتەوە. ئەگەر لە بیرم بێ دواتر بەرپرسی ئاسانسۆرەکە دەردەکەم.

پێشتر کەندو کۆسپەکان تەگەرەی دەخستە کارەکانم. بەڵام قەت وەك ئێستا وەڕەزیان نەکردووم. بەردەوام لە شکست بێزار بووم و قەت تامی تاڵی شکستم نەچێشتبوو. بەڵام ئێستا کە هەست بە تامی تاڵی ئەو دەکەم و ناهومێد و داماوم دەکا. نازانم توانایی ئەوەم هەیە کارێك ئەنجام بدەم یان نا.

ئەوەش چەشنێك دۆڕاندن و بردنەوەیە. بەردەوام حەوڵم داوە لە ژیانم دا سەرکەوتوو بم. لە سەردەمی منداڵی‌دا لە تەواوی کایە و کێبەرکێ‌کاندا براوە بووم. هەرچەند جاری وابوو فێڵم دەکرد. پێم خۆش بوو لەگەڵ براکانم زۆرانبازی بکەم. لە هەمووان خۆشتر ئەوکاتانە بوو کە دایك و بابم فریو دەدا و وام لێدەکردن کە ڕێك کارەکانم دووپات بکەنەوە.

لە قۆناغی کۆتایی خوێندنیش‌دا ڕۆڵێکی بێ‌وێنەم لە کاروباری خوێندەواری و وەرزشەکان‌دا هەبوو. دەمزانی چۆن ڕەقیبەکانم لە سەر ڕێ لاببەم و لێیان ببەمەوە. بۆ هەرکارێك لە پێش‌دا فرتو فێڵی ئەوکارەم دەدۆزییەوە و زانیاریم بەدەست دەهێنا و ژیانم بەوانە بەسەر دەبرد.

له سەردەمی خۆناسیش دا لەگەڵ کچەکان کێبەرکێم دەکرد و بێگومان سەرکەوتنم بەدەست دەهێنا. زاڵ بوون و بردنەوە لە کچان چێژو تامێکی تایبەتی هەبوو. پێم خۆش بوو کچانی بەنازو نووز، کچانی بەهەست، باڵابەرز، کچانی کورتەباڵا و بەتایبەت ئەوانەی ڕەوەك بوون و خۆیان بەدەستەوە نەدەدا. بەدەست بهێنم.

ئێستا دەزانم کە بۆ پێم خۆش نەبوو کەس لێم بباتەوە و هەر بۆخۆم براوەبم. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەفتاری گەورەکان و براکانم. ئەوان دەیانگوت تۆ منداڵی و گاڵتەیان پێدەکردم و منیش حەولم دەدا خۆم نیشان بدەم.

هەر لە منداڵییەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕۆژیخۆی تۆڵەیان لێدەکەمەوە. کورد وتەنی: «کەنگرو ماست بەوەختی خۆی».

باوکم زۆری پێ خۆش بوو کە تۆڵەی خۆم دەکەمەوە و لە بەرانبەریاندا ڕادەوەستم. چەندجار گوێم لێبووە کە گوتوویەتی: «بەم زووانە ئەم بێچوولەیە. وەك باوکی لێ دێ».

لە زانکۆ ماف ناسیم خوێندو توانیم بە پلەیەکی باش خوێندەواری تەواو بکەم و بۆ ڕێکخراوەیەکی ماف ناسی دەعوەت کرام. دوای بیست ساڵ، ئێستا ئەندامی ئەم ڕێکخراوەیەم و داهات و پارەی ساڵانەم لەوپەڕی باشیدایە. لە کاتێکدا براکانم پیشەی باوکمیان ڕەچاو کردووە و داهاتی کارەکەیان بەش دەکەن. جاری وایە سەرکەوتن بەخۆڕایی بەدەستنایە و کارێکی سانا نییە. هەرچەند لە زانکۆ ڕەقیبی یەکتر بووین و لە

گۆڕەپانی وانەو خوێندندا بەزەیمان بە یەکتردا نەدەهات. بەڵام حاڵی بووم کە لە دنیای بێبەزەیی و خۆباییدا پێویستمان بەو وانانە هەیە. هەروەها بۆم ڕوون بۆوە کە نابێ بهێڵین حەریف خۆی بنوێنێ. بۆ سەرکەوتن دەبێ فرت و فێڵ بزانی و چکۆلەترین هەل لەکیس نەدەی. جاریوایە پێویستە هەرکارێك ـ هەرئەندازە ناڕەوا بێ ـ وڵام بدرێتەوە و بەربەرەکانێی لەگەڵ بکەی.

بەوحاڵەش. بۆ سەرکەوتن حەوڵم دەداو بەردەوام بەخۆم ڕادەگەیشتم هەتا ببمە مرۆڤێکی پەست و نانەجیبب. لەکلاسەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتیدا بەشداریم دەکرد و لەناو دڵی خەڵك دا جێگای خۆم دەکردەوە و دواتر فریوم دەدان.

فێربووم درۆ بکەم، کەڵەك لێدەم و ڕاستییەکان بگۆڕم. فێربووم کە کەسێك لە عەرز بدەم و لەکاتی خۆیدا پلە و پایەی بەرمەسەر. بەو هەمووە هونەر و زانیارییەوە دەبوو پارێزەربم یان دەمتوانی بە باشی پێشانگەی سەیارە بەڕێوەبەرم.

پارێزەرێکی سەرکەوتوو بووم. شانازیم بە توانایی و لێهاتوویی خۆم دەکرد. بەتایبەت ئەوکاتانەی بە ئیشتیای خۆم یاسام دەگۆڕی. هەتا ناڕەواترِ بێ، باشترە. کەڵكوەرگرتن لە یاسا ـ بۆ کارێکی ڕەوا ـ هونەر نییە و هەمووکەس دەتوانێ ئەنجامی بدا. بەڵام تەنیا مرۆڤێکی لێزان و کارامە دەتوانێ بۆ قازانج و ئامانجی خۆی یاسا بگۆڕێ و بەپێچەوانەی یاسا کار بکا.

زۆرم پێخۆشە مرۆڤی مەندو خاوەنکەسایەتی ببەزێنم. لە سەر ئەوباوەڕەم کە گەورەترین ئەرکی من ئەوەیە کە ئەو مرۆڤانە فێر بکەم کە بڕکردن و کەمایەسی نەهێنان یانیچی.

تائێستا زەماوەندم نەکردووە و پەشیمان نیم. ئەگەر پێم خۆش بێ کەسێك پەیدا دەکەم و ماوەیەك لەگەڵی ڕادەبوێرم. ئیدی گێرەو کێشە بۆخۆم سازناکەم. ئیدی کارم بە خەرجی ژنو منداڵ نییە و ئیجازە نادەم کەسێکی تر لە کاروبارمدا بیروڕا دەربڕێ یان لە بیرو بۆچوونی من کەڵك وەرگرێ. ئەویش بێئەوەی پارەی ویزیتی ڕاوێژ بدا. پێمخۆشە توانایی و زانایی خۆم نیشان لێژنەی دادپەروەر بدەم. ئەوەش قازانجی بەربەرەکانێ و چەلەحانێ لە بەرانبەر سیستەمی دادوەرە هەشت کەس قانیع دەکەی کە مووەکلەکەت وەك منداڵێکی بەرمەمکان بێتاوان و پاکو مەعسوومە، تەنانەت ئەگەر پارەی بانکی لە گیرفان دەرهێنن.

واشنیە کە تەنیا هەمووشتێکم بۆخۆم بوێ و پێم خۆش بێ هەرخۆم براوە بم. دەمهەوێ تەواوی کارمەندەکانم براوە بن. لەبەرئەوە وەك ئەسپ کاریان پێدەکەم و تاقەتی هەڵەکردنیانم نیە. هەرچەند جاری وایە تووشی هەڵە دەبن و دەڵێن کارمان زۆرە بەڵام قەت ئیجازە نادەم تاوان و هەڵەکاری خۆی بخاتە ئەستۆی کەسێکی دیکە. لەوە ناخۆشتر نیە کەسێك لە بەرانبەرم دا گورج و خێرایی خۆی نیشان بدا. بۆخۆم بەڕێوەبەرم و کەس ناتوانێ بڵێ ئەوە بکەو ئەوە مەکە یان ڕەخنەم لێ بگرێ.

بەوحاڵەش لە شەڕو قڕەی کارگێڕانم ماندوو بووم و جگە لەوانە وەك جاران وەفاداری و دۆستایەتی نەماوە.لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا، چەندجار کارمەندەکانم گۆڕیوە. ئیدی مونشی و پیت چنی باش پەیدا نابێ. جاری وایە ناوەکانیانم لە بیر دەچێتەوە.

لە پێش‌دا، حیساب و کاروباری ئیدارە بەدەست خۆم بوو تەنیا بۆخۆم دەمزانی چم کردووە. بەڵام ئێستا هاوبەشەکانم بەردەوام بەشوێنمەوەن. بۆخۆم نووسینگەکەم بەورۆژە گەیاند کەچی دەبێ وەڵام دەری ئەو ئاغایانە بم، نا قەبوولی ناکەم. چۆن کاری وا دەکەم هێندە لەمێژ نیە بەدزییەوە پارەیەکی زۆرم وەك «دەسگری» هەڵگرتووە.

جگە لە کارمەند و هاوبەشەکانم، کڕیارەکانیش تووڕەم دەکەن. لە مانگی ڕابردوو سێ کەس لە مۆوەکەلەکانم (لەبەرئەوەی لە پەروەندەکەیان دا کەمتەرخەمیم کردووە.) شکایەتیان لێکردم. دەزانم کە شکستم خواردووە. بەڵام لیژنەی دادوەری ئەوەندە تێگەیشتوو نەبوون کە قسەکانم کاریگەرییان لە سەر دانێ. هێندێك لە دۆسیەکان بەم شێوەیە بوون.

هەڵبەت زۆر گرینگ نیە و بە شێوەی خۆم ئەم دۆسیە تاوتوێ دەکەم و کارێك دەکەم کە بیر لە سکاڵا نەکەنەوە و پەشیمان ببنەوە. بەڵام سەرم لەوکارە سووڕماوە کە بۆچی هێندێ لە مرۆڤەکان کە تەواوی ژیانیان بە دۆڕاوی بردۆتەسەر، کەچی بە دۆڕانێك قەڵس دەبن و گێرەو کێشە سازدەکەن؟ بەجۆرێك کە بەوە تاوانبارم دەکەن کە بۆ لەگەڵ لایەنی دیکە

کاکە و برالەمان کردووە! ئەویش من کە بە حەیاتم مرۆڤەکانم نەفرۆشتووە، قسەی ئەوەمنیە پارەیەکی زۆرم پێ بدەن.
ئێستا کە هۆکاری ماندووبوونم دەزانم. وردە وردە بەو قەناعەتە دەگەم کە ئەم بارودۆخە بەرهەمی براوەبوونە جا بە هەرقیمەتێك بێ و ئیدی نامهەوێ گرینگی پێ بدەم.
من فرێدم لە ئاوا بارودۆخێکدا بینی. ئەو دەبێ لەو سێ شتە ڕاستەقینەیە حاڵی بێ.
١ ـ بەڕاستی براوە نەبوو، بەڵکوو تەنیا بێ شعوور بوو. بێشعووری چەشنێك نەخۆشییە کە کاتێك تووشی دەبێ ڕەفتارێکی سادیسمانەی ڕەچاو دەگرێ. لەڕاستیدا فرێد ماندوو نەبوو، بەڵکوو بێ شعووری ماندووی کردبوو.
٢ ـ ئەگەر کەسێك تووشی بێشعووری بێ بەسەر تەواوی ژیانیدا زاڵ دەبێ. بێ شعووری وەك مشەخۆر لە کەسێکیتر خۆراك وەردەگرێ و بەم زووانە بەرت نادا. هەر ئەوەندەی جارێك بە فیڵو تەڵەکە و زۆرەملێ سەرکەوتوو بی، تازە ناتوانی دەستی لێهەڵگری و وەك سووراو وایە هەتا زیاتری بخۆی تینوێتیت زیاتر دەبێ.
٣ ـ ئەگەر دەتهەوێ لەدەست بێشعووری ڕزگار بی، دەبێ بۆخۆت هەنگاو هەڵێنی و ڕێگای دەربازبوون بدۆزییەوە. چاوەڕوانی خەڵك مەبە. تەنانەت بیر لەوەش مەکەوە کە خەڵك بێشعوورن. ئەگەر بێشعووری، تەنیا

بۆخۆت دوژمنی خۆتی و تەنیا بۆخۆت دەتوانی لەو نەخۆشییە خۆت ڕزگار بکەی.

فرێد لەو بێ شعوورانە بوو کە بە هیچشتێك حاڵی نەدەبوو. یەکەمجار کە پێم گوت بێ شعوور. هیچ خۆی شلۆ نەکردو گوتی: «بێ شعوور بابتە».

گوتم: ڕاست دەکەی. بەڵام نەمزانی تۆش باوکم دەناسی و دۆستایەتیتان هەیە؟

فرێد گوتی: مەبەستم ئەوەبوو جنێوت پێبدەم.

پرسیم: بۆ؟

«ئەگەر من بێ شعووربم تۆش بێ شعووری».

گوتم: باشە هەر لە بەر ئەوە دەمهەوێ یارمەتیت بکەم.

دواتر فرێد بۆیگێڕامەوە کە تەنیا هۆکارێك کە منی بۆ دەرمانکردن هاندا ئەوەبوو کە ئەورۆژە ئەوەندەت پرسیار لێ کردم کە سەرەگێژەم گرتبوو. یانی سەرەتای قۆناغەکانی دەرمانکردن لێرەوە دەستیپێکرد و ئەوەش بابەتێکی گرینگی ڕوون کردەوە. لەوانەیە قۆناغی دەرمانکردنی هەر بێ شعوورێك لەگەڵ بێ شعوورێکی دیکە جیاوازی هەبێ. هەر بێ شعوورێك بۆخۆی قۆناغی دەرمانکردن دیاری دەکا. هەرچەند دان پێدانان بەوەی کە مرۆڤێکی بێ شعووری و نەخۆشی سادیسمت هەیە هەنگاوێکە بەرەو ئاقڵ بوون.

گرینگ هەنگاوی یەکەمە. دواتر ئەو قۆناغانەی خوارەوە بۆ چارەسەرکردنی بێ شعووری سەردەگرێ.

*دۆزینەوەی ئەم ڕاستییە کە دەتوانین ژیانمان بگۆڕین. لەڕاستیدا هەر بێ شعوورێك بۆ چاکسازی خۆی حەول بدا ئەوا یارمەتی دەدا بەوەی کە ژیانێکی باشی لە سەر گۆی زەوی هەبێ.

* حاڵی بوون لەو تایبەتمەندی و کەسایەتیە پووچانەی کە هووهەوێنی بێ شعووری ئێوەیە.

* حاڵی بوون لەم بابەتە کە بە گۆڕینی ڕەفتاری خۆمان دەتوانین سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆمان ڕاکێشین و لە بابەتی ئەوەی پاشقولمان بدەن، دۆستی ڕاستەقینەی ئێمە بن.

بەڕێوەبردنی ئەم گۆڕانگاریانە هەروا سانا نیە، چونکە پێویستی بە گۆڕانێکی بنەمایی لە ڕەفتاری مرۆڤدا هەیە. ئەوکات سەبارەت بە بیرو بۆچوونی بنەماڵە و دۆستان ﴿لەمەڕ خۆت﴾ سەرت سووڕ دەمێنێ. تەنانەت هەست بە تاوان و سەرشۆڕی دەکەی. شتێك کە بۆ چارەسەری بێشعووری تاقەت پڕووکێنە، بەڵام ئەرخەیان بە ناهومێد نابی.

بەختەوەرانە بەسەرهاتی فرێد بە خێروخۆشی تەواو بوو. ئاخری تێگەیشت کە لەم دنیایەدا مرۆڤی شکستخواردوو لە مرۆڤی سەرکەوتوو پترە و ئەگەر دەیهەوێ خۆشەویست بێ ئەوا دەبێ لەگەڵ بەزیوەکان بێ. فرێد لەگەڵ مەگ زەماوەندی کرد، سەیارەکەی بەو پۆلیسە فرۆشت کە پێشتر جەریمەی کردبوو (دواتر ڕوون بۆوە کە سەیارەکەی فرێدی بەدڵ بووە) و بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو سووکایەتی و ئازارانەی دەرحەق بە

کارگێڕەکانی ئەنجامی دابوو، پاداشی بە هەمووان دا و زیاتر لە مووچەی خۆیان پارەی پێدان.
دواتر دەستی لە کار کێشاوە و کەوتە گەل پارێزەرانی ئاشتی لە ئەفغانستان. کۆڕی ڕێزلێنان و ماڵاوایی ئەو ئەوەندە قەرەباڵغ بوو کە لە مێژووی نووسینگەکەدا بێ وێنە بوو.

## بابەتی دووهەم:

## چەند بەسەرهاتی دیکە

«پێم وانەبوو بێ شعوورم. وەك سەردارێکی زۆر دار وابووم کە بە ئازار و بێ حورمەتی کردن بە کەس و کارم خۆشحاڵ دەبووم».

پریسیلا . بێ شعوورێك کە خەریکی چارەسەرییە

لەوانەیە هێندێك لە تایبەتمەندی خۆتان لە بەسەرهاتی فرێددا (کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد) ببیننەوە. زۆرم لەو بەسەرهاتانە بیستووە. بەڵام تەواوی بێ شعوورەکان لە ئاوا بەسەرهاتێکدا کورت نابێتەوە. چەشنەکانی بێ شعووری زۆرن و دەبێ تاوتوێ بکرێن. چەند نموونە لەو ڕووداوانە دەگێڕینەوە.

*

ئەلێکسێس، باڵابەرز، لەبەردڵان و کرچ و کاڵە. تەمەنی چل ساڵە. دەڵێ لە کارەکەم دا سەرکەوتووم، بەڵام لە پەیوەندییەکی دلۆڤانی دا خۆی بە بەزیو و ناکام لەقەڵەم دەدا. واتە ئەم مرۆڤەش وەك بێ شعوورەکانی تر سەبارەت بە خۆی هیچ نازانێ.

ئەلێکسێس ئەو کوڕانەی خۆش دەویست کە خۆشیان لەگەڵ ڕابواردبا. پەیوەندی گرتن لەگەڵ ئەلێکسیس کارێکی دژوار نەبوو بەجۆرێك کە لەڕێوە لەگەڵ کابرا دەخەوت و بۆ ئەو تۆفیری نەدەکرد هەرکەس پارەی دابایە لەگەڵ ئەو بوو. ئەوانیش (کوڕان) باشترین لیباس و زێڕیان بۆ

دەکرێ هەتا نەتوانێ قەرەبووی بکاتەوە و قەرزدار بێ. هەمیشە سەیارەیەکی بەڕۆژ و ئاپارتمانێکی گرانبای بۆ ئامادە کرابوو. بەڕای ئەو پیاوەکان هەر بۆئەوە باشن کە دەرگام بۆ بکەنەوە، لەبەرم هەستن و بە سەرم دا هەڵبڵێن و پارەم پێبدەن.

ئەلێکسێس لە بنکەیەکی ڕاگەیاندنەوە دەستی پێکرد. ئەو شوێنەی کە بە کەڵك وەرگرتن لە بیرو ڕای خەڵك و خۆنواندنی فێڵە بازانە توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ. لە کارەکانیدا وەك پشیلە وابوو، یانی ڕاستەوخۆ مشت ومڕی لەگەڵ کەس نەدەکرد و بەفێڵ و کەڵەك کارەکانی جێبەجێ دەکرد. بە شاردنەوەی نووسراوەکان و نەدانی زانیاری بە هاوکارەکانی، فریوی دەدان وەك گەمژەیەك هەڵس وکەوتی لەگەڵ دەکردن. ئەلێکسێس زۆر وەستایانە سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا بەبێ ئەوەی خۆی ماندوو بکا و بەرپرسایەتی هەڵەکانی بەئەستۆوە نەدەگرت.

ئەو بە دڵڕفێنی و لەباری خۆی توانی سەرنجی مشتەرییەکان بۆلای ئاژانس ڕاکێشێ و پلەوپایە بەدەست بهێنێ و لەو بارودۆخە بەهرە وەرگرێ، بەجۆرێك کە زۆرکەس ئێرەییان پێ دەبرد. بێگومان ئەلێکسێس دەیزانی نانی جوانی و زیرەکی خۆی دەخوا. سەرەڕای ئەوانە لە ژیانی خۆی ناڕازی بوو. لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هەتا سی ساڵی و تا ڕادەیەك چل‌ساڵییەوە دڵی خۆش‌بوو. بەڵام هەتا تەمەنی زیاتر دەبوو پرسیارێك ئازاری دەدا و مێشکی سەرقاڵ دەکرد کە داخوا مرۆڤێکی سەرکەوتوو بووم یان لەش فرۆش؟

هەرچەند ئەوەندەی شارەزایی هەبوو کە ئەم کێشەیە چارەسەر بکا. بەڵام ئەم پرسیارە لە دەروونـی دا سـنگی داکوتـابوو. وردە وردە بـیرو بۆچـوونی سەبارەت بە پیاوەکان دەگۆڕدرا. ئەوانەی پارەیان هەبوو، یان پیر بوون یان ناشیرین، ئەگەر جوان و ڕێك وپێك بوایە ئەوا دەبوو بـە پیـاوێکی ڕووت و ڕەجاڵ. ئەگەر کەسێکی ماقووڵ خۆشەویستی خۆی دەربڕیبا، ئەلێکسێس دەیزانـی گەمژەیـە و نـاتوانێ کەسـایەتی ڕاسـتەقینەی ئـەو بدۆزێتـەوە. ئەلێکسێس نەیدەهێشت کەس بە سەریدا زاڵ بێ. تەنیا لە بن لێفـەدا زاڵ بوونی پیاوەکانی قەبووڵ دەکرد.

بەڵام نارەزایەتی لە پیاوان بەشێك لە ڕووداوەکە بوو. ئەلێکسێس دۆستی نـەبوو. هاوکارەکـانی ببوونـە دوژمـنی قەستەسـەری و هیچـیان خۆشـیان نەدەویست. لەگەڵ دراوسێکانیش بەردەوام شـەڕو مشـتو مـڕی بـوو. لـە هەرکوێ پێی خۆش با سەیارەکەی ڕادەگرت و دەنگی موزیکی زیاد دەکرد و بە کراسێکی تەنك کە نیوەی گیـانی بـە دەرەوە بـوو، بـە نێـو خـەڵك دا دەڕۆیشت. هەرچەند پیاوەکان پێیان خۆش بـوو بـە ڕووتـی بگـەڕێ. بـەڵام ژنەکان وەك ماری برینداریان لێ دەهات.

ئەلێکسێس تەنانەت لەگەڵ دایکیشی دەردی دڵـی نـەدەکرد. لەمێژ بـوو قسـەی لەگـەڵ دایکـی نـەکردبوو (لەوکاتـەوە کـە ئەلێکسـێس درەنـگ دەهاتەوە ماڵێ و نەیهێشت بوو حەوتوویـەك بچـێتە دەرێ). قـەت جـوابی تەلەفوونەکانی نەدەداوە و نامە و پەیامەکانی بە نەکراوەیی دەناردەوە.

ئەلێکسێسی بێ چارە، بەتوانا و ساماندار بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوانە چارەڕەش بوو. تۆ بڵێی ئێرەیی و چاوچنۆکی خەڵك وای لێکردبێ؟ یان بێ شعوورە و بەس؟

کاتێك ئەلێکسێس هاتەلام زانیم کە دایکی مرۆڤێکی لاسار بووە و بەردەوام ڕەخنەی لێ گرتووە و بەدەگمەن بۆ سەرکەوتنەکانی ستایشی کردووە. دایکی ئێرەیی بە لێهاتوویی و جوان چاکی ئەلێکسێس کردووە و حەولی داوە ژیانی لێ تاڵ بکا.

دەمزانی دەردی چییە و چارەسەری سانا بوو. گوتم: «دایکت بێ شعوورە». بە تووڕەییەوە پرسی: «ئێوە سەعاتی سەد دۆلارم لێ وەردەگرن. ئەوە وەڵامدانەوەیە. بۆ خۆم نازانم بێ شعوورە؟» خەریك بوو بڕوا کە بە قامکی دۆشاو مژە حاڵیم کرد ڕاوەستە و تاقەتت بێ. پێم وایە هەر بە ئاماژەی قامکم حاڵی بوو کە کۆم ناسم و ئیجازەی دا درێژە بە قسەکانم بدەم. گوتم: «تۆ منداڵی دایکێکی بێ شعووری».

گوتی: ئەوە ڕاستە.

کاتێك تاوانەکان دەخرانە ئەستۆی کەسێکی تر، هەستی بە هێمنایەتی دەکرد. گوتم: بۆخۆت ویستووتە لەمپەرێك لە مابەین خۆت و دایکت دروست بێ. دیوارێك کە تەواوی پەیوەندییەکانی ئینسانی تێك داوە.

پرسی: یانی چی؟

حاڵیمکرد: «یانی تۆش بێ شعووری».

بە ڕێنوێنی و یارمەتی من و گروپێکی دەرمانی، ئاخری بێ‌شعووری خۆی قەبووڵ کرد و زانی کە بێ‌شعووری وای لێکردووە ساختەچێتی بکا. درۆ بکا و بە ناڕەوا مافی خەڵك پێ‌شێل بکا. هەرچەند لە سەر چاکسازی و ڕەفتاری جینسی ئەلێکسێس کارم دەکرد و دەبێ بڵێم چارەسەرکردنی ئەو سەرکەوتنێکی هەیەجانی و هەست بزوێن بوو!

ئێستا لە شاری پێتزبۆرگ ژیان بەسەر دەبا و لە دووکانێکی گەورەدا سەندووقدارە. لەگەڵ کرێکارێك زەماوەندی کردووە. منداڵێکیان هەیە و یەکی دیکەش بەڕێوەیە. ئەلێکسێس بەختەوەرە و لانیکەم بێ شعوور نییە.

هۆبێرت منداڵێکی نۆ ساڵە بوو کە بۆ چارەسەری هێنایانەلام. دایك و بابی نەگبەتیان پێ‌دەگوت و لە قوتابخانە دەرەجەی «بە تەواوی زەین‌کوێری» هەبوو. چوار دەرمانکار جوابیان کردبوو. دواتر دوانیان پیشەی دەرمانکاریان وێڵ کردبوو و ڕوویان لە پیشەیەك کردبوو کە دڵەتەپە و گوشاری ڕەوانی کەمتر بێ. یەکیان شێری دەستەمۆ دەکردو ئەوەی دیکەش ببوو بە پشکێنەری مادە سڕکەرەکان. لەڕاستیدا ئەویش بێ شعوور بوو.

کێشەی هۆبێرت بە سانایی بابەتەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بێ‌شعووری بەرهەمی سەردەمی منداڵی و بارهێنانی خراپ نیە. لەوانەیە کەسێك وەك ئەلێکسێس هەڵکەوێ. بەڵام بێ‌گومان هۆبێرت لە بەر

کاریگـەری سـەردەمی منـدالّی بـێ شـعوور نـەبووە. چـونکە بۆخـۆی منداڵێکی تەواو نەبوو.

کێشـەی سـەرەکی هـۆبێرت ئـەوەبوو کـە چـاوی دیـتنی بەختـەوەری و ئاسایشی خەڵکی نەبوو. بۆ وێنە ئەگەر چەند کچ، بێدەنگ، بۆ خـواردنی عەسرانەیەك کۆببانـەوە، دەسـبەجێ دانیشـتنەکەی لـێتێـك دەدان. وەك فرۆکەوانێکی ژاپۆنی کردەوەیەکی خۆکوژانـەی ئـەنجام دەدا. بەسـەریان دا دەیگوراند و قـاپ و قاچاخەکانی فـڕێ دەدان: جارێـك گـووی سـەگی لـە ئەستێرەی مەلەکردن هاویشت و ئەم شوێنەی بە خەڵك چۆڵ کرد.

هۆبێرت تایبەتمەندی پۆزیتیڤیشی هەبوو. بۆ وێنە لەو منداڵانـە بـوو کـە قەت لە تاقیکارییەکاندا چاوی لە کـەس نـەدەکرد. لـەباتی ئـەوکارە بـێ تامانـە دەسـتی دەدا چـەك و دەچـووە مـاڵی مامۆسـتاکەی و هەڕەشـەی لێدەکردو نومرەی قەبووڵی لێ دەستاند.

بابەتی هۆبێرت، بەوهۆیە کە جگە لە خراپەکاری و ئـازاری خـەڵك هـیچ حاڵی نەدەبوو، بابەتێکی دژوار بوو. کاتێك گوتم تۆ بێشعووری. گوتی تۆ یەکەم کەسی کە بە باشی سـەبارەت بـە مـن قسـە دەکـەی و بـەم وشـەیە «بێشعووری» خۆشحاڵ بوو. هەناسەیەکم هەڵکێشا و زانیم کـە بەڕاستی ئەم بابەتە دژوارە.

منیش پیاوێك نیم کـە لەبـەر ئەوشـتانە هـەڵێم و بڕیـارم گرتـووە کـە بـۆ چارەسەری ئەم منداڵە لە ئەزموونـەکانم کـەڵك وەرگـرم. تۆژینـەوەی سـێ قامکە یەکێك لەو ئەزموونانە بوو. لەو ڕۆژەوە لەگەڵ هۆبێرت ڕۆژانێکی

خۆش بەسەر دەبەین و بە خۆشحاڵییەوە ڕایدەگەیەنم کە بەم زووانە میداڵی پێشاهەنگی وەردەگرێ.

والتێر قەشە بوو. چواردەساڵە ئەم ئیشە دەکا و لە دوازدە کەلیسادا خزمەتی کردووە. بۆ فێربوونی ئەنجیل و وتاری ئایینی حەولی دەدا و خۆی بە پسپۆڕی نەخۆشی ڕەوانی و چارەسەری تاوانبارەکان دەزانی. بۆخۆی دەیزانی کە لە ڕێگای حەق و ئەرکی خودایی دا ژیانی بەخت کردووە و خەریکە لەناو دەچێ.

والتێر لە وتارە ئایینییەکان دا ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەرکی ئێمەیە لە بارەگای خودادا ئاگامان لە کردەوەکانمان بێ. چونکە بە چکۆلەترین هەڵە تووشی گوناح دەبین. هەمووجارێ دەیگوت: «خودایەك کە ئاگای لە جووڵاندنەوەی گەڵای دارەکانە. چکۆلەترین هەڵەی من و تۆ دەزانێ و قەت فەرامۆشی ناکا».

جاری وابوو والتێر لە کاتی وتاری ئایینیدا تووڕە دەبوو هەڕەشە و هێرشی دەکرد، بەجۆرێك کە خەڵك لە جیددیەتی والتێر سەریان سووڕدەما. چەندجار لێژنەی بەڕێوەبەرایەتی کەلیسا بە گوێیاندا دابوو. بەڵام بە بەکاربردنی وشەی سەیرو سەمەرە و ڕواڵەتی پارسایانە نەتەنیا ڕەخنەکان قەبووڵ ناکا بەڵکوو قەرزداریشت دەکا. والتێر دەیگوت خزمەتکاری ڕاستەقینەی خودا. دوژمنی زۆرە و دەبێ لێژنەی بەڕێوەبەرایەتی کەلیسا پێشی ئەم کارە بگرێ.

ئەلێکسێسی بێ چارە، بەتوانا و ساماندار بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوانە چارەڕەش بوو. تۆ بڵێی ئێرەیی و چاوچنۆکی خەڵك وای لێکردبێ؟ یان بێ شعوورە و بەس؟

کاتێك ئەلێکسێس هاتەلام زانیم کە دایکی مرۆڤێکی لاسار بووە و بەردەوام ڕەخنەی لێ‌گرتووە و بەدەگمەن بۆ سەرکەوتنەکانی ستایشی کردووە. دایکی ئێرەیی بە لێهاتوویی و جوان چاکی ئەلێکسێس کردووە و حەولی داوە ژیانی لێ تاڵ بکا.

دەمزانی دەردی چییە و چارەسەری سانا بوو. گوتم: «دایکت بێ‌شعوورە». بە تووڕەییەوە پرسی: «ئێوە سەعاتی سەد دۆلارم لێ وەردەگرن. ئەوە وەڵامدانەوەیە. بۆ خۆم نازانم بێ‌شعوورە؟» خەریك بوو بڕوا کە بە قامکی دۆشاو مژە حاڵیم‌کرد ڕاوەستە و تاقەتت بێ. پێم وایە هەر بە ئاماژەی قامکم حاڵی بوو کە کۆم ناسم و ئیجازەی‌دا درێژە بە قسەکانم بدەم. گوتم: «تۆ منداڵی دایکێکی بێ شعووری».

گوتی: ئەوە ڕاستە.

کاتێك تاوانەکان دەخرانە ئەستۆی کەسێکی تر، هەستی بە هێمنایەتی دەکرد. گوتم: بۆخۆت ویستووتە لەمپەرێك لە مابەین خۆت و دایکت دروست بێ. دیوارێك کە تەواوی پەیوەندییەکانی ئینسانی تێك داوە.

پرسی: یانی‌چی؟

حاڵیم‌کرد: «یانی تۆش بێ شعووری».

کردبوو. سەرەڕای ئەوانە والتێر خۆی نەدۆڕاندو دەیگوت ئەوانە ڕێگایەك بوو، بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانی مەسیح کە دەفەرمێ «دراوسێکەت خۆش بوێ». ماڵی خودا دەبێ بەردەوام کراوە بێ. ڕۆژبێ، یان نیوەشەو!

والتێریان ناردە کەلیسای سێزدەهەم، بەڵام ئۆسقۆف وێنەکانی بۆ ڕۆژی تەنگانە ڕاگرت. زەربەی گورج و بڕ ئەوکاتە بوو کە هاوسەری والتێر دەستی منداڵەکانی گرت و چووە ماڵی بابی و قەبووڵی کرد لە بنکەی نێونەتەوەیی پەرەپێدانی بێ دینی دا کار بکا. والتێر پەشۆکاو بوو.. وایدەزانی ئۆسقۆف پشتیوانی لێدەکاو لە هەموو بارودۆخێکدا هاوسەرەکەی لەگەڵ دەبێ. زۆری حەولدا ڕێگەچارەیەك بدۆزێتەوە، دوژمنەکانی گەمارۆیان دابوو کەس یارمەتی نەدەکردن. والتێر دەیگوت بۆ نەبێ کاری شەیتانە.

بەڵام بەڕاستی ئەم دۆخە شەیتان پێکی هێنابوو یان بێ شعووری؟

ئۆسقۆف والتێری بۆلای من نارد. من یارمەتیمدا کە بە وردی بڕوامەندی بە ئایینەکەی لێکداتەوە و قەبووڵی بکا کە قەت مرۆڤێکی بیرمەند، دڵسۆز و پارسا نەبووەو بێ شعوورێکی ئایینی بووە.

والتێر بۆی قەبووڵ نەدەکرا کە خۆی فریو داوە و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە تەواوی ڕەفتارو کردەوەکانی شەڕافەتمەندانە بووە و بگرە زۆرجار فیداکاری و گیان فیدایی کردووە. بۆ وێنە پێی وابوو کە خۆی فیدای ئەو ژنانە کردووە کە دەهاتنە کەلیسا و مێردەکانیان حەزی جنسیان کەم بووە یان نەیان ماوە.

بەڵام ئاخری تێگەیشت کە زیانی بە خەڵك گەیاندووە و بە ناڕەوا کەڵکی لە دەسەڵاتەکەی وەرگرتووە. ئەو ڕۆژەم قەت لە بیر ناچێ کە بە وردی سەیری کردم و گوتی: «من بێشعوور بووم. ڕۆڵە»؟ ئەمکاتانە بایەخی تایبەتی بە کارەکەم واتە دەرمانی نەخۆشی دەبەخشێ.

دوای چەند مانگ ڕاوێژ و دەرمان، والتێر ڕازی بوو لە هاوسەرەکەی جودا بێتەوە و کەلیسا بەجێ بهێڵێ. ناخۆشترین وانەی ئەو حاڵیبوون لەم بابەتە بوو کە خەڵك بۆ ئەوە دروست نەکراون کە خۆیانی پێوە بخلافێنێ و فەرمانیان بەسەردا لێ دا. کەوابوو دەبێ ڕەفتاری بگۆڕێ و ڕەوشێکی دیکە بگرێتەبەر. ئێستا کە والتێر لە قوژبنێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا وشترەوانە. پێی وایە دیسان خودای ناسیوەتەوە و دەڵێ «ئەگەر خودا بتوانێ ئیمانداری بۆمبڕێژ و بێشعووری وەك من ببەخشێ. ئەوا بەهێزترین و بەدەسەڵاتترینی جیهانە!» ئەگەر کەسێك داوای یارمەتی لێبکا. بە دلۆڤانییەوە وەڵام دەداتەوە: «قەت لەگەڵ بێ شعوور ڕاوێژ مەکە».

دەنگێ لە سارا لۆرە لۆر دەکا: درروووسستە»

*

لەم بەسەرهاتانە دەتوانین سەبارەت بە بێشعووری زانیاری بەدەست بهێنین. لەوانەیە هەر مرۆڤێك، چ ساماندار چ بێسامان، ژن یان پیاو، پیر یان جەوان تووشی بێشعووری بێ. بێشعووری لە هەرکات و ساتێکدا بەبێ ئەوەی ئاگادارت بکاتەوە، گیرۆدەت بکا.

پێشەوایەکی ئایینی کە لە ژیانی‌دا بێ شعووری زۆر دیتبوو، گێڕایەوە کە: «هەرکەسێك دەتوانێ لە بارودۆخێکی تایبەت دا بێ‌حەیا بێ. هەرکە بارودۆخەکە لەناو چوو، دەبێتەوە مرۆڤێکی ئاسایی و لە کردەوەکانی پەشیمان و شەرمەزار دەبێ. بەڵام مرۆڤی بێ شعوور لە بارودۆخێکی دیکە دەگەڕێ».

لەبەرئەوە ئەم بەسەرهاتانەم گێڕاوە کە جۆراوجۆری بێ شعوورەکان نیشان بدەم، هەرچەند هەر بێ‌شعوورێك تایبەتمەندی خۆی هەیە و بنەمایەك بۆ ناسینی بێ شعوورەکان لەئارادا نیە. چۆن مرۆڤەکان جۆراوجۆرن، بێ شعوورەکانیش جۆراوجۆرن و دەرمانی ئەم نەخۆشییەش پێچاوپێچ و جیاجیایە. ناساندنی ئەم نەخۆشییە، کتێبێکی دیکەی دەوێ. هەرچەند نووسینی کتێبێکی دیکە. پەیوەندی بە فرۆشی ئەم کتێبەوە هەیە. تەنیا لە ئامریکا سەد ملیۆن بێ شعوور هەیە و هەرکام لەوان تایبەتمەندی خۆیان هەیە و ئەوەش دڵگەرمم دەکا کتێبێ دیکە بنووسم و بۆ بازاڕی بنێرم.

هەرچۆنێك بێ هێندێك لە تایبەتمەندی هاوبەشی بێ شعوورەکان ئەوانەن:

*خۆبەزل زان

*وەرزکارێکی لەڕادەبەدەر

*خێرخوازێکی لەخۆبایی

*دەروونێکی ناوشیار کە کەس ناتوانێ ڕەخنەی لێ‌بکا (تەنانەت بە مەتەی ئەڵماسیش کون ناکرێ)

* بەدەست هێنانی دەسەڵات بە سووك و لاوازکردنی خەڵك

* دووریکردن لە خووو خدەی مرۆڤایەتی

* فریودان و کەڵك وەرگرتن لە مرۆڤی ساویلکە

لە بەشەکانی داهاتوودا ئەم تایبەتمەندییانە و هێندێك بابەتی دیکە دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە. جارێ خەمی ئەو شتانەتان نەبێ. ئاخری دەزانن لەکوێوە هاتوون و یەك گەوهەرتان هەیە.

چالاکییەکان:

١ ـ ئەرێ بە خوێندنەوەی کام چیرۆك کەسێکیترتان وەبیر دێتەوە؟ داخوا هەموورۆژێ لە بەر ئاوێنە نایبینن؟ کاتێك بیر لە خۆتان دەکەنەوە کام تایبەتمەندی لە خۆتاندا دەبینن؟ پێتان وایە کام ڕەفتار قێزەونە؟

٢ ـ بۆ نووسینی ئەم بابەتە دەفتەرێکی گەورە ئامادە بکەن و لە کاتی خوێندنەوەی ئەمکتێبە. ئەگەر بابەتێکی دیکەتان بە زەین گەیشت تۆماری بکەن.

## بابەتی سێهەم:

# ناساندنی بێ شعووری

«گەورەترین ڕێبازی ئافرێنەر ئەوەنیە کە خودا بۆچی ئەم جیهانەی ئافراندووە. بەڵکوو لە بەر ئەوەیە کە بۆچی بێ شعوورەکانی ئەوەندە بێشەرم و ڕوودار دروست کردووە».

نووسراوەیەك لە پشت درگای کەلیسای بۆستۆن

هەتا ئێرە، چەندجار لە وشەی بێ شعوور و بێ شعووری کەڵکمان وەرگرتووە. بەبێ ئەوەی مانای دروستی ئەم وشانە تاوتوێ بکەین. دەبێ بزانین بێشعووری لە چ بارودۆخێكدا پەرە دەگرێ. بۆ وێنە قەت بە خەیاڵمدا نەدەهات کە پارێزەرێکی بێشعوور لە دادگا بەرگریم لێبکا. مانای کورت و هێنانەوەی دەستەواژە ناتوانێ وشەی پێچاوپێچ و سەیرو سەمەرەی بێ شعووری لێك بداتەوە.

بەڵام ئەم بابەتە ڕێگە چارەی هەیە، زۆرینەی خەڵك لە سەر ئەو باوەڕەن کە: «لەوانەیە نەتوانم بێ شعووری تاریف بکەم، بەڵام بێگومان ئەگەر بێ شعوورێك ببینم. دەیناسم». هەموومان لە سەر ئەو باوەڕەین کە بە کەسێك دەڵێین بێشعوور کە ڕەفتاری ناحەزو وەڕەزکەری خۆی بە ئەنقەست نیشان دەدا و بە ئازار و سادیسمی خەڵك خۆشحاڵ دەبێ.

هەرچەند ڕەخنەگرانێك هەن کە سەبارەت بەم ناساندنە هەڵوێست دەگرن و دەڵێن ئەوە قسەی پزیشکێکی پسپۆڕە. وەڵامی زانستی من ئەوەیە کە: ئەوەندە هەڵوێست بگرن. تا گیانیان دەردەچێ!

هێندێك پێیان وایە کە بێشعووری وشەیەکی ڕەمەکییە کە بۆ گاڵتە و سووکایەتی بەکار دەبردرێ و دروست نیە لە زانستی پزیشکیدا کەڵکی لێوەرگرن، چونکە هەستی نەخۆشەکان زامدارتر دەکا. ئاشکرایە کە ئەم جەماوەرە سەبارەت بە بێ شعووری هیچ نازانن و ئەم ڕاستییە قەبووڵ ناکەن کە بێشعوورەکان هەستو کوڵی دەروونیان نیە. بە واتایەکی دیکە مادام هەستی بێ شعوور نەکەوێتە ڕەوتی دەرمان و چاك بوونەوە، زامدار نابێ.

هێندێك دەڵێن وشەی بێشعووری سوبژکتیو و زەینیە. وێدەچێ بێشعوور تەنیا لە بیرو هزری بینەردا هەبێ. من وەك کۆم ناسێکی قەدیمی پێموایە ئەم بیرۆکەیە تەنیا بۆ ئەوکەسانە دەبێ کە وشەی دژوار و نالەبار بەکار دەبەن. لێرەدا دەبێ بابەتێك ڕوون بکەمەوە کە پاراستن و بەکاربردنی ئەم وشەیە بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە بایەخ و گرینگایەتی زۆرە. وەك چۆن بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی پارانۆیا ناتوانین ئەم وشەیە لەبەرچاو نەگرین، بۆ دەرمانی بێشعووریش ناتوانین ئەم وشەیە وەلانێین. بەڵام نەخۆشێکی دیاریکراو نیە. دروستە کە خەڵکی ئاسایی پێیان خۆشنییە ناوی بێ شعووریان لە سەر دابنێن، بەڵام خۆ خەڵکی ئاسایی بێشعوور

نین. بێشعوورەکان بێچاو و ڕوو. وەڕەزکەر، بەسام و تڕزل و بەفیزن و دەبێ ناوێکیان هەبێ و برێك بەخۆیاندا بێنەوە.

زۆربەی خەڵك مەشرووباتی ئەلکۆلی دەخۆنەوە. کەچی کەس پێی خۆش نییە بە ئەلکۆلی ناوی ببەن بۆیە یەکەم قۆناغی وەلانانی ئەلکۆل ئەوەیە کە قەبووڵی بکا ئەلکۆلییە. کەوایە یەکەم هەنگاو بۆ چاك بوونەوە ئەوەیە کە بڵێی من بێ شعوورم.

لەڕاستیدا هێشتا ڕەخنەگران تێنەگەیشتوون کە بێشعووری نەخۆشییە نەك بێئەدەبی. تەنانەت سەرشێتی و سەربزێویش نیە، ئەوانە ئالۆزی کەسایەتین. لەحاڵێکدا بێ شعووری جۆرێك گیرۆدەبوونە بە دەسەڵات، سووکایەتی و سەرکوت کردنی خەڵکە. نەناسینی ئەرك و تینوێتی زاڵبوون بەسەر خەڵکە. ئەم نەخۆشییە هاوسەنگی مرۆڤ تێکدەداو داماو و کڵۆڵی دەکا. هەتا ببێ بە مرۆڤێکی باش و بیدرکێنێ و بڵێ «من بێ شعوورم».

زۆرێك لە مرۆڤەکان لە سەر ئەو باوەڕەن و لەگەڵ من هاودەنگن.

جارێك ژنێك بە تووڕەییەوە گوتی: هەرکەس بڵێ دنیا بێشعووری تێدا نیە. بۆخۆی بێ شعوورە. من سێ منداڵم هەیە و بە دەسیتانەوە پێوەبووم و سەرەڕای ئەوانە مێردەکەشم بێ شعوورە.

پێشخزمەتێك دەیگوت: «لە یەك مایلییەوە بێشعوورەکان دەناسم. لەو کەرە بێ دەمارانەن کە بێتوو درەنگ وەڵامیان بدەیتەوە دارو بەرد پێکدا دەدەن».

یەکێك لە بێ شعوورەکان دەیگوت: پێش ئەوەی قۆناغەکانی دەرمان کردن دەست پێبکەم، نەمدەزانی چەند بێ شعووری دیکەمان هەیە، بەڵام دوای ماوەیەك زانیم کە تەواوی هەڤاڵەکانم بێ شعوورن. کاتێك پێشنیارم کرد لە کەلاسی چارەسەریدا بەشداری بکەن وەك بێ شعوورەکان گاڵتەیان پێ دەکردم.

یەکێکی دیکە لە بێ شعوورەکان دەیگوت: لە بەر بێشعووری پیشە و بنەماڵەم لەدەست دا. بەتەمابووم دنیا داگیر بکەم و بە سەریدا زاڵ بم، لەحاڵێکدا دەسەڵاتی خۆم نەبوو.

هێندێك لە دەرمانکارەکان پێیان وایە مرۆڤەکان بێ شعوورن، تەنیا دەبێ بناسرێن. لەوانەیە ئەم بیرۆکەیە دروست بێ لانیکەم سەبارەت بە برێکار و دەڵاڵەکان.

کورتە مێژووی بێ شعووری

بێ شعوور هەمیشە بووە و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دەبێ. ئەوە تەواوی ئەو شتانەیە کە دەبێ سەبارەت بە مێژووی بێشعووری بیزانین.

## نیشانەکانی بێ شعووری

ئیپیدیمیۆلۆژی بێ شعووری نیشان دەدا کە زۆرکەس تووشی نەخۆشی بێ شعووری دەبن (چاو لە خشتەی خوارەوە بکەن). هەژمارێکی زۆر خەریکی کارن بەبێ ئەوەی توانایی و لێهاتوویان هەبێ. وەك کارمەندەکان، وتاربێژەکانی ئەخلاقی، یارمەتیدەری کۆمەڵایەتی و تەواوی ئەوکەسانەی کە دەیانهەوێ (تەنانەت بە سەربڕینی خەڵك) جیهان ڕزگار بکەن.

ئەو تاقم و گرووپانەی کە تووشی بێ شعووری دەبن

- کارگێڕانی ئیدارەیماڵیات و بەراورد
- ئەوکەسانەی وشەی ئاسایی بە شێوەیەکی سەیرو سەمەرە بەکار دەبەن و دەینووسن
- ئەفسەری بەڕێوەبەری شۆفیری
- مامۆستایانی چەپ خوازی زانکۆکان
- کارمەندی دەوڵەتی
- دەوڵەت
- بڕیکاری دادگا
- ئەو ژنانەی بەشوێن حەڕاجی و هەرزان فرۆشییەوەن
- تەواوی ئەوکەسانەی دەیانهەوێ بە داماوکردنی مرۆڤەکان، حەیوانەکان ڕزگار بکەن
- ئەو کەسانەی لە خێرومەندییەکاندا کار دەکەن
- ئەو خەڵکانەی ژیان لە شارە گەورەکانی وەك نیۆیۆرکیان پێ خۆشە
- ئەوانەی سەبارەت بە بێ شعووری کتێب دەنووسن

- ئەو کەسانەی کە بە کەیفی خۆیان شۆفیری دەکەن و دەڵێی شەقامەکان ملکی باب و باپیریانە
- ئەندامانی کۆمیسیۆنی شۆرای شار
- ئەو کەسانەی کە بە درۆ پێ دەکەنن و دەڵێن «ڕۆژباش»
- دەسەڵاتداری سەندیکاکان
- ئەو کەسانەی بە زۆری دەیانهەوێ خەڵك ڕێنوێنی بکەن
- ئەو ژنانەی ئیپلاسیۆن ناکەن
- نوێنەرانی کۆنگرەی ئامریکا - ئەو کەسانەی بە زۆری شت دەفرۆشن
- ڕەخنەگرانی چاپەمەنی - ئەو کەسانەی لە کاتی نانخواردندا قسە دەکەن
- ئەو کەسانەی بە گێچەڵ و هەڕەشەو گوڕەشە ماڵ و سامان بە دەست بهێن
- دیکتاتۆرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست
- هەرکەسێك بە جیددی بڕوانێتە ئەم کتێبە

- لەڕاستیدا هەرکارێك پەیوەندی بە یاسا هەبێ، بەتایبەت ئەوکارانەی دەبێ چاوەدێری و زۆریان لە سەر بێ، مەترسی بێ شعوور سازکردنیان هەیە، بەڵام زۆرترین مەترسی لە پیشەی نرخ بڕین و ماڵیاتدا دەبینرێ بەجۆرێك کە دوای چەند مانگ بۆخۆیان دەڵێن «بێ شعووری، پاشگری ناوی ئێمەیە. لێکۆڵینەوەکان نیشان دەدەن کە لەناو دوکتۆرەکانیشدا بێشعوور هەیە، یەکێك لەوانە تۆژینەوەی دوکتۆر ئێچ. ئێم. ڕۆیدە · دوکتۆر ڕۆید بەڵگە دەهێنێتەوە کە بێ شعوورەکان تینوی پلە و پایە و

دەسەڵاتن. هەروەها ئاماژە بەوە دەکا کە هیچ سیاسەتمەدارێك، وتاربێژ یان پزیشکێك لە بەر سیاسەت، وتار یان کاری پزیشکی بێ شعوور نەبووە، بەڵکوو لە بەر بێ شعووری خۆیان ڕوویان لەو پیشانە کردووە کە بەسەر خەڵکدا زاڵ بن.

لەوانەیە بێ شعووریش لە دایك و بابەوە - وەك میرات - بە مرۆڤەکان بگا. هەرچەند زۆرێك لە منداڵەکان لە بێ شعووری دایك و بابیان گلەییان هەیە و پێیان خۆش نییە ئاکاری دایكو بابیان ڕەچاو بکەن. یەکێك لە فاکتەرەکانی ناسینی بێ‌شعووری، توێژینەوە لە سەر تایبەتمەندی سەرخوازانەی ئەوانە. زۆربەیان ڕەفتارێکی هێرش‌بەرانە و ئاکاری ملهوڕانەیان هەیە. ئەگەر بە ملهوڕی و تۆقاندنی خەڵك بە ئامانجەکانیان نەگەن، ئەوا دەست‌دەکەن بە فێڵو تەڵەکە یان بەجۆرێك یاسا و ڕێساکان دەسکاری دەکەن کە بە قازانجی خۆیان تەواو بێ. لە کاتی پێویست و ئەستەمدا، دەزیقێنن، لە قەداوێن و خۆیان کز نیشان دەدەن. یەکێك لە فاکتەرەکانی بێ شعووری کە لە جیهاندا دەنگی‌داوە ئەوە بوو کە نیکیتا خوروشچۆف بە تاکەوشەکەی لە مێزی ڕێکخراوەی نەتەوەکانی دا و ڕایگەیاند ڕۆژئاوا دەخەمە گۆڕەوە .

ئاشکرایە کە ئەمجۆرە مرۆڤانە بەم زووانەو بە فەرمانێکی ئاسایی چاك نابن. ئەوان بۆخۆیان «داب و نەریتێکی نەنووسراویان» هەیە و بەپێی ئەو ڕەفتار دەکەن. هێندێك لەو داب و دەستوورانە بریتین لە:

*تەواوی گێروکێشەکان لەلایەن خەڵکەوە پێك هاتووە.

پێویست ناکا بنەماو چارەسەری کێشەکان بدۆزینەوە.
* خۆت مەدۆڕێنە. دەتوانی کەمایەسی و هەڵەکان بە بێشەرمی و
بێ حەیایی داپۆشی. هەرئەندازە تاوانت گەورەتر بێ دەبێ ڕووداری و
شوورەیت زیاتر بێ.
* تەنیا تۆ دەتوانی یاسا و ڕێساکان هەڵوەشێنییەوە. ئەگەر کەسێکی تر
ئەوکارەی کرد ئەوا بنەو بنەچەیان لەناو ببە.
* ئەگەر یاساکەت بە دڵ نەبوو، بە ئارەزووی خۆت یەکی تر دابنێ.
* ئەگەر بە ئامانجەکەت گەیشتی ئەویش بگۆڕە.
* لە توانایی خۆت بۆ بەدەست هێنانی هەرشتێکی چەپەڵ ئەرخەیان بە.

بۆخۆم بەم شێوەیە بێشعوور و بێ شعووریی دەناسێنم، یانی لەباتی گەڕان بۆ تاریفێکی پڕو گشتی، دەبێ بەدوای تایبەتمەندی و نیشانەکانی بکەوین. بێ شعوورەکان پێیان وایە یاسا بۆ ئەوان پێناسە و دیاری دەکرێ و لە خەڵك زیاترن و چاویان ڕەشە و دەتوانن هەموو کارێك بکەن. بێشعووری چەشنێك نەخۆشییە کە هێزی ناسینەوە و نرخ بڕی تووشبوان تێك دەدا و وایان لێ دەکا هەرچەشنە کارێکی ناڕەوا ئەنجام بدەن، بەبێ ئەوەی هەست بە تاوان، شەرم و پەشیمانی بکەن.

تۆ بڵێی بێشعووری نەخۆشی بێ؟ وەڵامی من بۆ ئەو پرسیارە «ئەرێیە». بێ شعووری نەخۆشی بێحەیایی و کەڵك وەرگرتن لە خەڵکە. مرۆڤی بێ شعوور لەکۆڵ خەڵك نابێتەوە و ئەگەر بیانوویان پێ نەگرێ و گێچەڵیان بۆ سازنەکا ناحەسێتەوە.

هۆکـاری دیکـەی ئـەم نەخۆشـییە ئەوەیـە کـە ڕۆژ لەگـەڵ ڕۆژ لـە زیادبوون‌دایە و دەبێ چارەسەر بکرێ. بۆ وێنە لە بازرگانی‌دا، بێ شعووری کـەم داهـات حـەول دەدا ببێتـە بـێ شـعوورییەکی گـەورە. ئـەم بابەتـە، بێ‌شعووری کردۆتە کێشەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی. لەوانەیە کەسێك کە دەتوانێ لە ڕۆژدا سەد کەس بێ‌چارە بکـا، سـەرکەوتن بەدەست بهـێنێ و ڕۆژێ هەزار کەس داماو بکا.

کێشەی بێ شعووری ئەوەیـە کـە مرۆڤـی بـێ شـعوور قـەبوولی ناکـا بـێ شعوورە. ئەگەر قەبوولیشی بکا تاوانەکەی دەخاتە ئەستۆی کەسێکی‌تـر. کەوایە نابێ تەنیا چارەسەری ڕەفتاری و بێ‌شەرمی و هەڕەشەو گوڕەشـەی ئەوان لە بەرچاو بگرین. دەبێ هێزی ناسینەوە و سیستەمی نرخ بڕی ئەوان دەرمان بکەین و کارێك بکەین کـە هەسـتی دەروونیـان ـ ئـەو هەسـتەی چەندین ساڵە وەلایان ناوە ـ بخەینە گەڕ. دەبـێ تایبەتمەنـدی مرۆڤایـەتیان زیندوو بکەینەوە و لەوانەیە ئەم کارە درێژخایەن و پڕووکێنەر بێ.

لەلایـەکی دیکـەوە، ئـەم نەخۆشـییە لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی‌تـر دەگوێزرێتەوە و لەوانەیە مرۆڤی بەهێزی وەك دەرمانکەریش گیرۆدەی بـێ و بەڵگـە هێنانـەوەی بـێ‌شـعوورەکان کاریگـەری لـە سـەر دانـێ و دوای ماوەیەك وەك بێ شعوورەکان ڕەفتار بکا.

بۆیە دەبێ بێ‌شعوورەکان لە دۆخی تابۆو پیرۆز بهێنینە دەرێ و بە باشـی نیشانیان بدەین. نابێ لە ناودێرکردنی بێ‌شعوورەکان بترسێین، چونکە ئـەو

پارێزو خزمەتکردنانە هەژماریان زیاتر و زیاتر دەکا و لە بێ شعووری دا نوقم دەبن.

ماوەیەکی زۆر، بێ شعووری نەخۆشییەکی «ناوی مەبە!» بوو. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بە غیرەتەوە باسی بکەین و بۆ چارەسەرکردنی حەول بدەین. ئەگەر دڵمان بەخۆمان ناسووتێ، دەبێ بۆ بەرەی داهاتوو ئەم کارە بکەین. دنیا لە مەترسی دایە.

چالاکییەکان

١ ـ قەت وەکوو بێ شعوورەکان هەڵسوکەوتتان کردووە؟

٢ ـ تا ئێستا سووکایەتیتان بە کەس کردووە یان ویستووتانە ئەم کارە بکەن؟

سەبارەت بەم کەسە لاپەڕەیەك یان دوو لاپەرە لە دەفتەرەکەتان تۆمار بکەن، دواتر بیخوێننەوە. پێتان وانیە بێ شعوورن؟

## بابەتی چوارەم:

## چییەتی بێ شعووری

((من باشم. تۆ بێ شعووری)).

کاردینالْ پۆشینگ

لەوانەیە دوو بێ شعوور سەبارەت بە چەمکی بێ شعووری بیرو ڕای جیاوازیان هەبێ ـ ئەوەش ئاساییە ـ بەڵام ئاخری قەبووڵی دەکەن کە بێشعوورن و دەتوانن پێکەوە قسە بکەن. هەستی دەروونیان بدرکێنن و شتە هاوبەشەکانیان تاوتوێ بکەن، هۆکار و شتە هاوبەشەکان چییەتی بێ شعووری پێك دەهێنن.

ئەگەر هۆکارەکان دیاری بکرێن بەباشی دەتوانین بێ شعوورەکان بناسین. پێش ئەوەی ئاماژە بەو هۆکارانە بکەم، پێویستە وەبیرتان بهێنمەوە کە لەوانەیە لەکاتی خوێندنەوەی پێرسیتی هۆکاری بەدیهێنەری بێ شعووریدا، خۆتان بە بێ شعوور لەقەڵەم بدەن. قەیناکەو پێتان وانەبێ مرۆڤێکی بێ بایەخ، گەندەڵ و سەقەتن، بەڵکوو تەنیا بێ شعوورن. ئەم بابەتە چاك بوونەوەتان خێراتر دەکا.

نابێ بێشعوورەکان لۆمە بکەین. هەرچۆنێك بێ تووشی ئەم نەخۆشییە بوون و ئەوەش لە کۆمەڵگای دوور خستوونەتەوە، بەڵام چاك دەبنەوە و چارەسەر دەکرێن. هێندێك لە بێ شعوورەکان وەك میرات لە دایكو بابیان پێیان دەگات، هێندێك قوربانی ئایینەکان دەبن و تاقمێك بە تێپەڕکردنی

خولی فێرکاری تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن. زۆرجار گوێ دان بە موسیقی پانک ڕاک، چاو لە تەلەفزیۆن کردن و ئەندامەتی لە تۆڕەکانیش کاریگەریان هەیە.

هێندێك بۆخۆیان بێ‌شعووریان پێخۆشە. چونکە بە بێ شعووری خێراتر بە ئامانجی خۆیان دەگەن. بۆ وێنە زۆرێك لە هەواڵنێرە لاوەکان لە سەرەتای کارەکانیاندا وەك مرۆڤێکی شەرمن ڕەفتار دەکەن، بەڵام کاتێك وەك پەیامنێرێکی تەلەفزیۆن ناو دەردەکا. شان لە سەد کەس دەداو پەنجاش وە بەرپێ دەدا تاکوو بڵێن هەواڵنێرێکی باشە و یەکەم کەس پەیامەکەی ناردووە.

بەم جۆرە بێ شعوورێکی نوێ دروست دەبێ. لە کۆمەڵگاش دا هەمیشە بە کەسێك پاداش دەدەن کە لە کارەکانیدا یەکەم بێ، وا دێتە بەرچاو کە بێ شعوورەکان سەرکەوتوون. لە بازرگانی دا، کەسێك کە بیرو ڕای خەڵك دەدزێ سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ و لە دەوڵەتیش‌دا هەرکەسێك بتوانێ باشتر و ژیرانەتر داخوازی خەڵك پێ شێل بکا ئەوا پلەو پایەی دەچێتە سەرتر. بەرەی نوێ، بێ‌شعوورەکان بە مرۆڤێکی سەرکەوتوو دەزانن و بەم بیرۆکە گەمژانەیە خۆیان دەکەنە کۆیلەی ئەوان.

بەداخەوە، بێ شعوورەکان سنووربەزێنن. بایەخ بۆ خەڵك دانانێن و بۆیان دەبێتە عادەت کە ئاوڕ لە خەڵك نەدەنەوە و ئەوەندە مافی خەڵك پێ‌شێل دەکەن کە ناتوانن دەستی لێ هەلگرن، ئاخری ڕۆژێك بێ شعوورێك لە خۆی بێ شعوورتر بەرپێ دەدا و زەلیل و داماوی دەکا.

بۆ بەدبەختی، بێ شعوورەکان هەرچۆنێك بێ کارو ژیانی هاوبەشی بەسەر دەبن و ئاکامی ئەو بێ شعوورییە لە درێژخایەن دا خۆی نیشان دەدا بەجۆرێك کە ڕەوتی لەناوچوونیان بیست تا سی ساڵ دەخایەنێ. ئێوان هۆرنی دەڵێ: «مرۆڤی بێ شعوور کارەکانی بە کەسێکی تر ئەنجام دەدا. بەڵام کاتێك ئەو کابرایە ماندوو بوو دەست لە کۆڵکێشی هەڵدەگرێ، سەری شۆڕ دەکا و هیچی پێ ناکرێ.

مرۆڤی بێ شعوور حەول دەدا بەسەر خەڵکدا زاڵ بێ و ژیانی مسۆگەر بکا. قەت کێشەکانی چارەسەر ناکا، تاوانەکان دەخاتە ئەستۆی کەسێکی‌تر. بەڵام ئاخری شکست دەهێنێ. بە کورتی بێ شعوور کەسێکە کە هەڵەکانی بە هەڵە جێبەجێ دەکا. ئێستا هێندێ لە تایبەتمەندی بێ شعوورەکان تاوتوێ دەکەین.

چاودێری‌کردن

دەبێ بەردەوام تاقمێك وەکوو نۆکەر ئاگایان لە بێ‌شعوورەکان بێ. فەرق ناکا دایکی‌بێ یان خزمەتکار. لە دنیای بازرگانی‌دا، هێندێك لە بەڕێوەبەران لە سەر ئەو باوەڕەن کە تاقمێك لە مرۆڤەکان تەنیا بۆ ئەوە دروست کراون کە تاوانەکان بەئەستۆوە بگرن هەتا بۆخۆیان زەرەر نەکەن و لە گەورەییان کەم نەبێتەوە. لە کاروباری دەوڵەتیشدا زۆرێك لە بەڕێوەبەران بۆ جێبەجێ‌کردنی هەرکارێك، دووکەس بەکرێ دەگرن. بێ شعوورەکان:

پێیان وایە مرۆڤەکان ئەرکی سەرشانیانە کە داخوازی ئەوان ئەنجام بدەن و بۆ خۆش ڕابواردنیان کەرەستەی پێویست ئامادە بکەن.

دەست لە کاروباری خەڵك وەردەدەن.

پێیان ناخۆشە خەڵك خەم خۆری یەکتر بن.

بەهەر چەشنە ئەرکێك ناڕەحەت دەبن و بە سووکایەتی لەقەڵەم دەدەن.

پێیان خۆشە خەڵك گیرو گرفتیان بێ، چونکە کەس بیر لە هەڵەکانیان ناکاتەوە.

پێیان خۆشە خەڵك دەستیان ماچ بکەن و داخوازییەکانیان پێشبینی بکەن.

کارێك دەکەن کە خەڵك خۆیان بە قەرزداری ئەوان بزانن.

بەجۆرێك یارمەتی خەڵك دەدەن کە تەمبێ بن و داوای هیچیان لێ نەکەن.

## بڕوابەخۆیی

بێ شعوورەکان بۆ خۆدۆزینەوە لە ئەرکەکان و بایەخ نەدان بە ڕاستیەکان داستانێکیان هەیە و لە خۆیان ڕادەبینن. چارلیز کامبێرباند (دەروونناس) دەڵێ: «بڕوابەخۆیی بێ شعوورەکان لەڕادەبەدەرە. ئەگەر شاژنی بریتانیا سەردانی زیندانێك بکا و لە ژووری بێ شعوورێك نزیك ببێتەوە، پێی وایە بەتایبەت بۆلای ئەو هاتووە و زۆری پێ خۆش دەبێ».

## بێ شعوورەکان:

*سپاسی خۆیان دەکەن.

*پێیان وایە خێرو بەرەکەتێکن کە خودا بەسەر خەڵکیدا باراندووون.

*پێیان وایە خەڵك بۆ هەمووشتێك لە بیرو ڕای ئەوان کەڵك وەردەگرن.

*پێیان وایە خودا ئەوانی ڕاسپاردووە هەتا ئەوکەسانەی بیرو ڕای جیاوازیان هەیە سزایان بدەن.

*دەزانن چۆن پارەی خەڵك خەرج بکەن.

*بۆ هەرکارێك پلانێکیان هەیە و لێهاتوون.

*کارێك دەکەن کە خەڵك وەك مار تێك هاڵێن و سەریان لێ بشێوێ.

*دەڵێن ئێمە قەت هەڵە ناکەین.

*بەردەوام تاوانەکانیان دەخەنە ئەستۆی کەسێکی تر.

*پێیان خۆشە ئەگەر پەرەستشیان ناکەن لانیکەم بە سەریاندا هەڵبڵێن.

*دەیانهەوێ بە سووکایەتی و گاڵتە پێ کردنی خەڵك، بڕوابەخۆیی خۆیان بەهێز بکەن.

## کەڵکی ناڕەوا

بێ شعوورەکان دەتوانن بە ناڕەوا کەڵك وەرگرن، بەڵام کەس ناتوانێ بە ناڕەوا کەڵکیان لێ وەرگرێ، مەگین بێ شعوورێکی لە خۆیان گەورەتر.

## هێرش بردن

بێ شعوورەکان شاڵاو بۆ هەمووشتێك دەبەن. لە شەڕدا حاڵەتێکی هێرش بەرانەیان هەیە. لە ئاشتیدا هەروا و تەنانەت لەکاتی گوتنی «خۆشم دەوێی»دا هێرش دەکەن. ئەگەر هیچ کام لەوانە جێبەجێ نەبێ بێ شعوورەکان لەم کاتانەی خوارەوەدا حاڵەتێکی هێرش بەرانە بەخۆیانەوە دەگرن:

*بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستن.

*کاتێك کە هەست بە کەم بوونەوەی دەسەڵاتیان دەکەن.

*کاتێك کە ڕەخنەیان لێ دەگرن.

*ئەگەر پیلانە خراپەکانیان ئاشکرا بکەی.

*ئەگەر دەسەڵاتیان بکەوێتە مەترسییەوە.

*کاتێك قیستی وەدواکەوتوویان دەدەنەوە.

## بیری دەمارگرژانە

تەواوی بێ شعوورەکان پێیان‌خۆشە لەو بارودۆخەدا بمێننەوە و حەول دەدەن بە بڕو بیانووهێنانەوە بۆ کارە ناڕەواکانیان، پێداگری بکەن. بۆیە زاتی ئەوەیان نیە یەك چرکە لە هەڵوێستی خۆیان پاشگەز بن، نەوەکوو ئەو نەختە وێژدانەی لە دەروونیاندا ماوە، کێشەیان بۆ ساز بکا.

کەوایە ئەم بابەتانەی خوارەوە کەڵکەڵەو نیگەرانی زۆربەی بێ شعوورەکانە:

*هێزو توانایان: تاوەکوو بتوانن بەردەوام هێز و توانایی خۆیان نیشان بدەن.

*ئابڕوویان: هەبوونیان بە وەجو ئابڕوویان بەسراوەتەوە ئەگەر لەکیسی بدەن هیچیان بۆ نامێنێتەوە.

*ئەرخەیانن لەوەیکە هەمیشە کەسێکیان هەیەو دەتوانێ تاوانەکانیان بەئەستۆوە بگرێ. هەر ئەوەش هۆکاری زەماوەندکردن و منداڵ بوونیانە.

*نەیارەکانیان و ئەوەیکە بزانن چ دەکەن.

*دۆستەکانیان و ئەوەیکە بزانن چ دەکەن.

*حیساب‌و کتابی ئەوکەسانەی قەرزدارن.

*ئەوەی کە تەواوی دنیا بزانێ سەیارەکەیان لە هی دراوسێکەیان باشترە.

*خەڵك بزانن کە ئەوانە مرۆڤێکی ئاسایی نین.

## بێ شەرمی

بێ شعوورەکان ڕایان وایە کە ژیان یانی بێ شەرمی و بێحەیایی. تەنانەت قسەکردن و بیروڕا دەربڕینی بێ شعووریش، تەنیا ڕێگەیە بۆ بێ حەیابوونی ئەو.

بێ شعوورەکان:

*بۆ هیچ شتێك لە سەفدا ڕاناوەستن و ڕێگایەك بۆ دەربازبوون لەم دۆخە دەدۆزنەوە.

*هەمیشە پێیان خۆشە دەستوور بدەن و بەسەر خەڵکدا زاڵ بن.

*بە کەس ناڵێن ئافەرین یان باریقەڵڵا، مەگین بیانهەوێ منداڵەکەیان سەرکۆنە بکەن و بڵێن: «وەك کوڕی فڵانکەست پێ ناکرێ».

*تەنیا بە شێوازێك قسە دەکەن: بەتەوس و توانج

*بە دەنگی زۆر بەرزەوە قسە دەکەن.

*کاری خەڵك بە هی خۆیان لەقەڵەم دەدەن.

*هەتا وەڵامی هێرشەکەیان نەدەیەوە، هێرش دەکەن.

*شوێنی ڕووداوەکە تێك نادەن، مادام بە قازانجی ئەوان بێ.

*پێیان وایە نەزاکەت، هێندێك داب و نەریتیە کە دەبێ خەڵك سەبارەت بە ئەوان ئەنجامی بدەن.

*ئەو ڕۆژەیان بەلاوە باشە کە ناچار نەبن، بابەتێکی باش بە خەڵك بڵێن.

## دەسەڵاتداری

ژیان لە ڕوانگەی بێ شعوورەکانەوە یانی زاڵ بوون بەسەر خەڵك. بۆیە هەمیشە نیگەرانی لەدەست دانی دەسەڵاتیانن. ئەوان بۆ بەردەوامی ئەم هەستە واتە دەسەڵات:

*بۆ چەوساندنەوە و قازانجی خۆیان، یاسا و ڕێساکان دەسکاری دەکەن.

*جگە لە خۆیان، دەبێ هەمووکەسێك پەیرەوی لەو یاسایانە بکا.

*بە قازانج و سیاسەتەکانی خۆیان، داب و نەریتەکان دەگۆڕن و ئەوەش کاری ئەوانی سانا کردۆتەوە و لە کاتی پێویستدا خەڵك لۆمە دەکەن.

*بە کلکەسووتە و زمانی لووس دەیانهەوێ بە پلە و پایە بگەن.

*دەوروپشتیان پڕە لەو زمان لووس و ماستاوکەرانە.

*بەردەوام دووپاتی دەکەنەوە کە ئەرکێکی گەورە و گرانیان بەئەستۆوەیە.

## شادمانی و حەنەکچی

ڕەنگە ناخۆشترین کاتی بێ شعوورەکان ئەوکاتە بێ کە ناچارە لەگەڵ خەڵك خۆشحاڵ بێ یان خەڵك دڵخۆش بکا. جارێك یەکێك لە پوورە بێشعوورەکانم بۆ شەوی کریسمەس دەعوەتی کردم، خەریك بوو هۆکاری نەبوونی هەستی خۆشحاڵی بۆ دەگێڕامەوە، بەڵام ڕێك لەوکاتەدا دەستیان بە پیرۆزبایی و چاك و چۆنی کرد. هەتا من ئازار بدەن و بێ دەنگم بکەن.

## بێ شعوورەکان دەتوانن:

*لێو بەبزە بن.

*گاڵتە بکەن.

*گاڵتە بە خەڵکی لێ قەوماو بکەن

*کاتێك وریایی و خێرایی خۆیان نیشان دەدەن، گەزگەز گەورە دەبن و هەست بە خۆشییەکی یەکجار زۆر دەکەن.

*بە گاڵتە و گەمە ئابڕووی یەکتر دەبەن.

بەڵام بەهیچ جۆرێك ناتوانن پێکەوە خۆشحاڵ بن یان بە جەفەنگ و شۆخی خەڵك دڵشاد بکەن.

## حاشاکردن

بێ شعوورەکان حاشاکردن بەجۆرێك هونەر، لە قەڵەم دەدەن. ئەوان هەموو شتێك ڕەت دەکەنەوە، ئەوەش ڕێگایەکە بۆ لە داو خستنیان. ئێوە دەتوانن پێچەوانەی بابەتێکیان پێ بڵێن و ئەوانیش ڕەتی دەکەنەوە و لە ئاکامدا داخوازی ئێوە مسۆگەر دەبێ. بێ شعوورەکان:

پێیان وایە ئاریشە و دژوارییان نیە.

پێیان وایە قەت هەڵە ناکەن.

خۆیان وانیشان دەدەن کە هۆکارو دانەری ئاریشەکان نین.

هەر وتەیەك کە دژی ئەوان بێ حاشای لێ دەکەن.

پێشوازی له «ڕەخنەی بێ کەڵك» دەکەن، بەڵام هەر ڕەخنەیەك کە بە قازانجیان نەبێ ئەوا بە ڕووخێنەرو قیناوی لەقەڵەم دەدەن.
پەیرەوی له سیاسەتی پارادۆکس ناکەن، بەڵام ئەگەر بەپێویستی بزانن بۆ هەر بابەتێك چەندین پارادۆکس و ناتەبایی دەهێنەوە.
پێیان وایە ڕاستی تەنیا کەرەستەیەکە بۆ ئاسایش و ئاسوودەیی ئەوان.
پێیان وایە وشەی «خوو خدە» وشەیەکی بێ مانا و بێ ناوەرۆکە.

## ترساندن

بێشعوورەکان حەزیان لە زینداندانیکردنی خەڵکە. ئەو ڕۆژەی یاسای کۆیلەداری له ئەمریکا هەڵوەشاوە ڕۆژی تازیەباری بێ شعوورەکان بوو. بەڵام دواتر دەستیان هەڵنەگرت و بە تۆقاندن و هەڕەشە و گوڕەشە توانیان وەکوو کۆیلەیەك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن. لە ڕاستیدا بێ شعووری هەر بێ شعوورێك، بە هەژماری ئەو هەڵدەسەنگێنن.

## بێ شعوورەکان:

*داوا له خەڵك دەکەن کەرەستەی خۆشی و شادی ئەوان ئامادە بکەن.
*هەرکەسێك گەمژە و نەزان بێ، دەیکەنە کۆیلەی خۆیان.
*لەوە دەترسن بێ شعوورێکی دیکە کۆیلەکانیان لێ بستێنێ.
*هەمیشە بۆ ترساندنی خەڵك ئامادەن.
*ئەگەر دەسەڵات بەدەستەوە بگرن. ڕەفتاری عەیدی ئەمین ڕەچاو دەکەن.

## ئەوین

ژیانی بێ شعوور، ئەوین و ئەویندارییە، بەڵام سەبارەت بە خۆی. یەکێك لە نەخۆشەکانم دەیگوت: «تەنیا ئامانجی بێ شعوور ئەوەیە کە خۆی خۆش دەوێ. کارێك کە پێت خۆشە چەند جار دووپاتی بکەیەوە». بێ شعوورەکان ناتوانن کەسێکی دیکەیان خۆش بوێ. (مەگین بە قازانجیان بێ) سەبارەت بە ئەوین بیرێکی بەرتەسکیان هەیە و یەکلایەنەیە. بۆ وێنە دەتوانن شت ببەخشنەوە، بەڵام تەنیا بۆ خۆیان. گەڕۆکی ئەوینی بێ شعوور، گەڕۆکێکی چکۆلەیە و تەنیا جێگەی کەسێکی دەبێتەوەو بەس.

بێ شعوورەکان ئەڤینداری ئەوشتانەن:

*خۆیان

*بارودۆخیان

*ماڵ و سامانیان

*پلەو پایەیان

*سەیارەکانیان

*زانستیان (ئەگەر خوێندەواریان هەبێ)

*بیرو ڕایان

*بیری دەمارگرژانەیان

*ناخۆش ویستن، ئەم بابەتە لەمەڕ ئەو بێ شعوورانەیە کە خۆیان مراندووە، یانی بێ شعوورێك کە بەڕواڵەت خوازیاری وتوویژ و قسەکردنە.

بێ شعوورەکان ئەوینێکی تایبەتیان بەو شتانە هەیە:

*هەر شتێك کە هی خۆیان نەبێ.

*دەسەڵات

*ناوبانگ دەرکردن

## فیداکاری

وشەیەك کە لە قامووسی بێ شعوورەکاندا مانای نیە، قسەی ئەوەم نیە کە خەڵك فەرمانبەری داخوازییەکانیان بن. ئەوەندە قڕنیس و چڕن کە هیچشتێك وێڵ ناکەن، تەنانەت بە قازانجیشیان بێ. ئەگەر لە بێشعوورێك بپرسی. «دەکرێ ئەم دوو بلیتەی کێبەرکێی تۆپی پێیەم لێ قەبووڵ بکەی؟» داخوازییەکەت قەبووڵ ناکا. چونکە داوای شتێکت لێ کردووە. واباشە بڵێی «دەمهەویست بۆ ئەم کێ بەرکێیە لەگەڵ خۆم بتبەم. بەڵام بەڵێنیم بە کوڕەکەم داوە. تۆ نایەی، دێی؟ بەهەر شێوەیەك بێ لە ماوەی دوو خولەکدا ئامادە دەبێ و بلیتەکانت لێدەستێنێ و ئەگەر بەرنامەکانیشی تێك بدا کەڵکیان لێ وەردەگرێ.

## پەیوەندی

بێ شعوورەکان زۆربلەن، بەتایبەت لەمەڕ خۆیان. هەروەها لە قسەکردندا زۆرزان و لێزانن. بەمشێوەیە دەتوانن خۆیان لە کارەکان بدزنەوە. هەمووشتێك ڕەت بکەنەوە. بۆ وێنە بە سیاسەتێکی بێشعوور لەمەڕ ناترسێ کە چەندجار مانای قسەکانی بگۆڕێ و خەڵکی پێ خۆشحاڵ و ڕازی بکا.

باشترین کاتی مرۆڤی بێ شعوور ئەوکاتەیە کە داوای لێدەکەی بۆ بەرنامە و پرۆژەکان ڕێو شوێنێك پەیا بکا یان ڕێگە چارەیەك بدۆزێتەوە. خۆی وا نیشان دەدا کە هەموو ڕێگایەکی تاقی کردۆتەوە و دەیانزانێ، کاتێك هەموویان گێژ و سەرسام بوون ئەم دەرفەتە بەدەست دەهێنێ و خۆی هەڵدەکێشێ و بابەتەکە دووپات دەکاتەوە و لە بەر ئەوەی یەکەم جار لە قسەکانی حاڵی نەبوون، بە گەمژە و نەزانیان لەقەڵەم دەدا . بەم جۆرە، ئەم بێ شعوورە بە زیرەکی بەڕێوەبەری کاروبارەکان بەدەستەوە دەگرێ کە هیچی لێنازانێ و جەماوەرێکی ماندوو هیلاك وەشوێنی دەکەون.

کاتێك لەگەڵ خەڵك پەیوەندی بەرقەرار دەکەن.

*لە عەیب و کەمایەسی خەڵك دەکۆڵنەوە.

*خۆیان وەك مرۆڤێکی گەورە نیشان دەدەن.

*مەبەستی خۆیان ناڵێن.

*ئاماژە بە ئامانجیان ناکەن.

*گرنگی بە زانستی خەڵك نادەن و پێیان وایە خەڵك هاودەنگیانن

*بۆ پاراستنی خۆیان درۆ دەکەن.

*بۆ خراپ کردنی خەڵك درۆ دەکەن.

*بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك درۆ دەکەن.

*ڕاستییەکان دەگۆڕن.

*سەرژماری و ڕاپۆرتەکان دەسکاری دەکەن.

*لە بیرو ڕای کەس ناپرسن، مەگەر لێی بدزن یان کاریان پێی بێ.

*هەرکات هەست بە بەش خوراویی بکەن، گێرەو کێشە سازدەکەن.

*هەرکات خەڵك بزانن مافیان پێ شێل دەکەن. خێرا بابەتەکە دەگۆڕن.

گوێ شل‌کردن

بێ شعوورەکان بیسەرێکی باشن. ئەوان لە دۆزینەوەی خاڵی لاواز و کەم و کوورپییەکانی دۆست و نەیاران‌دا کارامە و لێهاتوون و لە کاتی گونجاودا ئەم زانیارییانە بەکار دەبەن. جگە لەوانە، بە خۆمراندن و گوێ شل‌کردن، کارێك دەکەن کە خەڵك پێیان‌دا هەڵبلێن، بەڵام بەڕواڵەت خۆیان وانیشان دەدەن کە گوێیان شل‌کردووە، ئەگینا هیچ نابیستن.

## هەڵکردن و سازان

بێ شعوورەکان دەیانهەوێ هەمیشە لە بەرزاییدا بن و خەڵکیش لە شیوو دۆڵدا. مادام لەم بارودۆخەدابن و لە نزمی‌دا بژین لەگەڵتان دەسازێن، بەڵام بێتوو ئەم دۆخە بگۆڕن، بۆ وێنە بەرەو بەرزایی بڕۆن ئەوا

دڵیان دەشکێنن و گێرەو کێشە بۆخۆتان سازدەکەن. ئەوان سنووریان خۆش دەوێ و تەنانەت ئەڤینداری دیوارەکانن. دەیانهەوێ بە هەرشێوەیەك سنوورێك بۆ خۆیان دروست بکەن هەتا دۆست و دوژمنیان حاڵی بکەن کە لە مەڵبەندی ئەوان نزیك نەبنەوە. تەنانەت لە ماڵیشدا ئەم سنوورە دادەنێن هەتا ئەرخەیانبن کە هاوسەر و منداڵەکانیان نزیك نابنەوە و لە ناخی بێ ئاوەزیان حاڵی نابن.

بێ شعوورەکان لەگەڵ هەمووشتێك دەسازێن بەومەرجەی کە سنووریان نەبەزێنێ. دنیایەکی چکۆلەیە. پێت وانییە؟

مرۆڤی بێ شعوور پێی وایە سازان یانی:

❁هەرچی ئەوان گوتیان بە دروست و ڕەوای بزانین.

❁بیرو باوەڕی ناپەسەندیان پەسەند بکەین.

❁هەرچی هەڵەیە ناکامی کاری ئێوەیە.

❁هەرکەس بیهەوێ بە ئێمە بگا، لەبەین دەچێ.

## بڕوا پێ کردن

بێ شعوورەکان جێیمتمانە و باوەڕ نین و بەردەوام خەریکی درۆ و پیلان گێڕانن و بۆ گەیشتن بە مەبەستیان ئەم سیاسەتە (پیلانگێڕی) بەکار دەبەن. ئەوان بە تەنیا ژیان بەسەر دەبەن و بۆ بەدەستهێنانی کەرەستەی ژیان و ئاسایشیان لێزان و لێهاتوون.

## تووڕەیی

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کە بێشعوورەکان حەزیان لێیەتی تووڕەیی و قەڵسبوونە. لەو مرۆڤانە نین کە جاروبار تووڕە بن، بەڵکوو هەمیشە تووڕەن. پێیان وایە تووڕەیی باشترین کەرەستەیە بۆ بەربەرەکانێ دەگەڵ ئەم جیهانە دڕندەیە. دروشمی ئەوان ئەوەیە: «قەت لەگەڵ مرۆڤی تووڕە وەك خۆی هەڵسوکەوت مەکە، بەڵکوو دە بەرانبەر تووڕەتر هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکە».

بێ شعوورەکان لەم کاتانەدا تووڕە دەبن:

*بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستن.

*درەنگ ڕۆژنامەیان بەدەست بگا، تەنانەت ئابوونمانیش نەبن.

*قاوەکەیان سارد بێتەوە.

*دەستوور و فەرمانەکانیان بە باشی بەڕێوە نەچێ.

*خەڵك پێشبینی ئەوە نەکەن کە داخوازییەکانیان چییە.

*کەش و هەوا بارانی بێ.

※کەش و هەوا هەوری بێ.
※کەسێك لە قسەکانیان بکۆڵێتەوە و پرسیار بکا.
※کەسێك پاردۆکسیان ئاشکرا بکا.
※کەسێکیان وەگیر نەکەوێ کە تاوانەکانیان بەئەستۆوە نەگرێ.
※کەسێك بیهەوێ لۆمەیان بکا.
※هەڤاڵێك کە داوای وامیان لێ بکا.
※دۆستێك کە داوای قەرزەکەی بکاتەوە.
※ئەگەر پێیان بڵێن هەست بە بەرپرسایەتی بکەن.
※منداڵەکانیان وەکوو گەورەکان ڕەفتار بکەن.
※هاوسەرەکانیان لێیان وەڕەز بن.

## پێوەندی جنسی

بێ شعوورەکان. چ ژن چ پیاو، پێیان خۆشە بۆخۆیان، خۆیان ڕەحەت بکەن و ئەوەیان لە نزیکی پێ خۆشترە. بەو حاڵەش جیاوازی ڕواڵەتی شتی خۆش لەگەڵ ئەسڵی شتەکە دەزانن. کەوایە دەیانهەوێ ژیانێکی ئاساییان هەبێ.

ئەوەش بۆ بێ شعوورەکان یانی:

※پێوەندی جینسیان هەیە، بەڵام ناتوانن چێژی لێوەرگرن. بەتایبەت سەبارەت بە ژنان.

※پێوەندی جنسیان هەیە، بەڵام ناهێڵن هاوسەریان چێژ لێ وەرگرن. ئەمبابەتە زیاتر سەبارەت بە پیاوەکانە.

*لــه پێوەنــدی جنســیدا، وەك كەرەســتەیەك بــۆ زاڵبــوون بەســەر هاوسەرەكانیان كەڵك وەردەگرن. زۆرجار بە درۆ دەڵێن سەرمان دێشێ.

*لــه پێوەنــدی جنســیدا، وەك كەرەســتەیەك بــۆ تــەمبێ كردنــی هاوسەرەكانیان كەڵك وەردەگرن.

*پێوەنـدی جنسـیان بـەلاوە گـرینگ نیـە، چـونكە لـە كـاتی نزیكـی لـە هاوسەرەكانیان دەدەن.

*پێوەندی جنسیان هەیە، بەڵام قەت باسی ناكەن.

*ئەوەنـدە لاسـارن كـە سـەرەڕای ژیـانی هاوبـەش، دەیانهـەوێ سـەڵتو بێهاوسەر بمێننەوە.

* خەیانەت و ناپاكیان بە لاوە گرینگ نییـە ئەگـەر لـە لایـەن خۆیانـەوە بێ.

## پرتەو بۆڵەكردن

زۆرترین پرتەو بۆڵە لە دنیای بێ شعوورەكاندایـە. ئـائۆمی گـادفلای لـە كتێبی هونەری بۆڵاندن دا دەنووسێ: هـەر مرۆڤێـك لـە ژیانیـدا دەتـوانێ سەبارەت بە كەمو كووڕی و پەرێشانی ببۆڵێنێ، بەڵام تـەنیا بـێ شـعووری ڕاستەقینە دەتوانێ سەبارەت بە هەمووشتێك تەنانەت ئەو شتانەی پەسند و ڕەوایە، بۆڵەبۆڵ بكا. «مرۆڤی بێ شعوور تەنانەت لە ڕۆژێكـی بـەهاری ڕەخنە دەگرێ كە هەموو كەسێك پێیان خۆشە. ئەگـەر هـیچ نـەبێ دەڵـێ دەنگی مەلەكان ئازارم دەدەن.

بێ شعوورەکان لەمەڕ بابەت گەلی خوارەوە بۆڵەبۆڵ دەکەن:

*کاتێك کە خەڵك پارە بەدەست دەهێنن.

*کاتێك بۆخۆیان پارە بەدەست دەهێنن.

*سەبارەت بەم ڕاستییە کە دەبێ بۆ بژێویان کار بکەن.

*سەبارەت بەو ڕۆژانەی کە بێ کار بوون.

*سەبارەت بە کەش و هەوا.

*سەبارەت بە ئابوور.

*سەبارەت بە گوێ نەدانی منداڵەکانیان.

*سەبارەت بە چاوەنواڕی دایك و بابیان. «ئێمە ئەوانمان ناردۆتە خانەی بەساڵاچووان. ئیدی چیان دەوێ؟»

*ئەگەر لە وەسییەت نامەی بابە گەورەیاندا بێ بەش کرابێن.

*سەبارەت بە سیاسەتی جیهانی، ئەگەر پەیوەندی بەوانیشەوە نەبێ.

*کاتێك کە پێیان وایە کەس ئەوانی خۆش ناوێ.

*لەدەست ئەوکەسانەی کە بەردەوام پرتەو بۆڵە دەکەن.

## هاوبەشی

بێ شعوورەکان حەزیان لە هاوبەش‌کردنە و بەم هۆیە بەشی خەڵکیش دەدەن. بۆ وێنە هەمیشە ئامادەن سەبارەت بەم بابەتانەی خوارەوە خەڵك بکەنە هاوبەشی خۆیان:

*نەهاتی و بەدبەختییەکان.

*تاوانەکان

*بەڵێنییەکان

*شتی بێ مانا

*دڵەڕاوکێ

*بیرو ڕایان

*نەخۆشییەکانیان

بەپێچەوانە، پێیان خۆش‌نییە لەم چەند شتەی خوارەوە خەڵك بکەنە هاوبەشی خۆیان:

*ستایش و پێداهەڵگوتن

*دەسەڵات

*پارە

*کات‌و ساتیان

*لە کاتی سەرکەوتنیاندا

*هەلو دەرفەتەکان

*بیرو بۆچوونە باشەکان

*دۆستایەتی

*سەرنجی خەڵك

*خۆشەویستی

ناتەبایی و مەتەڵ

ڕەفتاری بێ شعوورەکان هەمیشە وەکوو مەتەڵۆکێك وایە. هەڵس وکەوتیان ناتەبایی و پارادۆکسی تێدایە و وەك ئەوەی ژیشکێك بێ هەوێ فوودانە بفرۆشێ. ئەم کێشەیە زیاتر بە خۆفریودان و حولحولیبوونی بێ شعوورەکانەوە پەیوەندی هەیە. بەم جۆرە ناتەبایی و پاردۆکسی بێ شعوورەکان کەڵەکە دەبێ و تووشی بارودۆخێکیان دەکا کە نازانن کێن و بیر و باوەڕیان چیە. بێ شعوورەکان:

*زۆرجار پەیمانشکێنی دەکەن و درۆ دەکەن، بەوحاڵەش خۆیان بە مرۆڤێکی دروستکار دەزانن.

*کاتێك پارەی شتەکانیان پێدەدەن، باسی سەربەخۆیی و جوامێری خۆیان دەکەن.

*کاتێك ڕیسەکەتان لێ دەکەنەوە و خوری و ڕەنجتان بەبا دەدەن، خۆیان بە خەم خۆری ئێوە دەزانن.

*سەبارەت بە بابەتێك قسە دەکەن کە هیچ زانیارییەکیان نیە و سەرەڕای ئەوانە لەحاند ئەو بابەتە لاسار و سەرەڕۆن.

*خۆیان بە عاشقی خودا و دوژمنی شەیتان دەزانن، لەکاتێکدا ناکاریان ئینکاری خودا و پەیرەوی لە شەیتانە.

## لەناوچوون

بێ شعووریش وەکوو هەر گیرۆدەییەك نەخۆشییەکی قەرەبوو نەکراو لە سەر ژیانی مرۆڤ بەجێ دەهێڵێ. بێ شعووربوونی لاوێکی بیست‌و پێنج ساڵە ئاسانە، بەڵام زۆر سەخت و پڕوکێنەرە کە تۆ بیست ساڵ لەگەڵ ئەم نەخۆشییە ژیان بەسەر بەری. بۆیە ڕەوتی زەمەن بێ شعوورەکان ماندوو و پەك کەوتە دەکا و وردە وردە بەو قەناعەتە دەگەن کە لەوانەیە ڕێگایەکی دیکە بۆ ژیوارکردن هەبێ. نیشانەکانی لەکارکەوتوویی بێ شعوورەکان ئەوانەن:

*لە پرتەو بۆڵە دەکەون.

*ئیدی باوەڕیان بە تووڕڕەهاتی خۆیان نییە.

*نامە بۆ مامەخەمە دەنووسن، بەڵکوو دەردی دڵیان بۆ بکا.

* وردە وردە ئەم ڕاستییە قەبووڵ دەکەن کە ئیدی خەڵك لێیان دوور دەکەونەوە، تەنانەت خۆشەویستەکانیان.

*هەر دەهات گومانیان پتر دەبوو: «خودایەگیان... خۆ من بێ شعوور نیم؟!»

دەرهێنانی پێرستێك لە نیشانەکانی بێ شعووری کارێکی ئەستەمە. وەکوو هەر نەخۆشییەك، مرۆڤی بێ شعووریش بەشێوەی جۆراوجۆر ڕەفتار

دەکا. پێویست نییە بێ شعوورێك تەواوی تایبەتمەندییەکانی هەبێ، بەڵام ئەو نیشانانەی ئاماژەمان پێکرد. بە ڕمێن ترین نیشانەی بێ شعوورەکانن.

گرینگترین و باشترین شت بۆ بێ شعوور ئەوەیە کە ئەو جۆرەی کە هەیە، خۆی بناسێ. بێشعوور دەبێ بزانێ کە خەڵك سەرچاوەی کێشەکانی نین، تەنیا بۆخۆیەتی کە وەك نەخۆشێك دەڕوانێتە ژیان.

هەروەك ئالیس گۆبێر لە کتێبی. «بێ شعووری گیرۆیی» دا دەنووسێ، هەر بێشعوورێکی ئاسایی دەتوانێ هەتا بیست کەس تووشی پەرێشانی، شێتی، دەسرپێژی و کردەوەی ناڕەوا بکا. تەنانەت مرۆڤی ڕەوانی و ژاکاویش بە ئەندازەی بێ شعوورەکان زیانی لێنەکەوتووە. ئەوان سەبارەت بەوەیکە دەورو پشتیان پڕە لە مرۆڤی تووڕە و ڕەوانی، گلەییان هەیە. بێخەبەر لەوەیکە لە بەر ئاکارو ڕەفتاری بێ شعوورەکان تووشی ئەوڕۆژە بوون.

کەوایە بۆ مرۆڤی بێ شعوور سوودی نییە کە لە هاوسەری جودا بێتەوە یان سەرپەرستی منداڵەکانی بەئەستۆوە نەگرێ یان پیشەی بگۆڕێ، چونکە لە بارودۆخی نوێشدا خەڵك وەڕەز و تووڕە دەکا. نا ئەوکارانە بەکەڵك نایە و تەنیا بەشێوەیەك چارەسەر دەکرێ. دەبێ قەبووڵی بکا کە نەخۆشە و خەڵکیش گیرۆدە دەکا. دەبێ دەست لە بێ شعووری هەڵگرێ و ببێ بە مرۆڤێکی بەشەرەف.

دەرمانکردن شادیهێنەرە. ڕەنگە بۆ بێ شعوورێك ئاسایی و سەیرو سەمەرە بێ، بەڵام ژیانی بێتووڕەیی، فێڵ، درۆ و پیلانگێڕان، ژیانێکی خۆش و خەم ڕەوێنە. لە سەرەتای دەرمان کردندا گێژ و خۆلە و پێی وایە ژیان پووچ و بێمانایە. بەڵام وردە وردە ئەم هەستە بەرەو باش بوون دەچێ و ئاوەز و مرۆڤایەتی دێتە جێگەی.

## چالاکییەکان:

١ ـ چاوێك بە پێڕستەکانی ئەم بەشەدا بخشێنەوە. هەر تایبەتمەندییەك کە بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی ئێوەیە، بە ژمارە دوو دیاری بکەن و ئەگەر لە تایبەتمەندی ئێوەدا نەبوو ئەوا ژمارەی سیفری بۆ دابنێن. ئەگەر لە نێوان ئەم دووانەدا بوو ڕەقەمی یەکی بۆ دابنێن. دواتر ژمارەکان کۆ بکەنەوە. ئەگەر کۆی ژمارەکان لە سەد زیاتر بوو دەبێ بۆ درێژەی ژیانتان جێگایەك لە جەمسەری باشوور یان کەلاوە کۆنێك پەیدا بکەن.

٢ ــ ئەم ئەزموونە بۆ هەڤاڵەکانتان تاقی بکەنەوە. ئەگەر کۆی ژمارەکانیان لە سەد تێپەڕی ئەوا بزانن کە «کەنگر و قووماش نابن بە وێڵداش»!

٣ ـ پێتانوایە ئەگەر کەسێك ژياننامەی ئێوەی نووسیبا، چەندکەس باوەڕیان دەکرد و چەندکەس دەیانگوت چەندە سووكو چرووك و پێکەنینییە؟

## بابەتی پێنجەم:

## ڕادەی بێ شعووری

«بێ شعووری بۆ تەواوی وەرزەکان لە شەقام و سارا چ لە سەنگەر، چ لەبەندەر»

شیعری ژیان لەگەڵ بێ شعوورەکان

نابێ بۆ تاوتوێکردن و ناسینی بێ شعووری، تەنیا پێڕستێك لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە دیاری بکەین. بێ شعووری ئەوەندەی دەسەڵات هەیە کە ژیانی خەڵك سەرقاڵ بکا و گیرۆدەیان بکا. مادام لەم تایبەتمەندییە حاڵی نەبین ناتوانین دەرمانی ئەم نەخۆشییە بدۆزینەوە.

هێندێك پێیان وایە بێ‌شعووری چەند خاڵی هاوبەشی لەگەڵ با هەیە. لەوانەیە با، ئارام بێ یان توند، هەروەها جاروبار بێ یان یەك جۆر بێ. جاری وایە ئەوەندە ئارامە کە تەنیا قژی سەرمان دەشێوێنێ یان ئەوەندە توندە کە خێوەت هەڵدەقەنێ. جاری واشە وەك گەردەلوول و تۆفانەکان خۆی نیشان دەدا و وڵات وێران دەکا.

لە پێش دا وەك بایەکی ئاسایی ڕەفتار دەکەن و نیگەرانی دروست ناکەن. بەڵام لە دەرفەتێکی لەباردا وەکوو گێژەڵووکەیەك دەتوانێ بە خێرایی و دڕندەیی هێرش بەرنەسەر خەڵك. کەوایە دەبێ بۆ باشتر ناسینی بێ‌شعوور ڕادەی بێ شعووری دیاری بکەین. هەروەها بزانین کە چۆن بێ شعوورەکان

فێر دەبن بیر و باوەڕیان ناسک بکەن و لە ژێر دەمامکی نەجیبی و پاکی دا خۆیان بشارنەوە.

جاری وایە بۆ تاکێکی زانا و عاقڵ، حاڵی بوون لە بێ شعوورێك کە وەك دەسەڵاتدارێك چۆتە دەروونیەوە. چونکە مرۆڤ لەگەڵ ئەوشتانە هەڵدەکا کە خۆی پێ گرتووە. بەڵام بێ شعووری وەك هێزێکی زاڵ ڕەخنە دەکاتە دەروونی و لە کەسایەتی ئەودا دەتوێتەوە. ئەم ڕەوتە کاتێك دەست پێدەکا کە بەسەر مرۆڤدا زاڵ بێ و ئەوجار پێی دەڵێ چ بکا و چلۆن کارەکان ئەنجام بدا. لە سەرەتاوە تاك لەو دەست تێوەردانە تووڕە دەبێ، بەڵام دوای بیست خولەك بابەتەکەی بۆ ئاسایی دەبێ. ئەم هێزە زاڵە، یانی بێشعوور، وەك بەشێك لە خۆی قەبووڵ دەکا و تەنانەت لە کاتی خۆیدا پاڵی پێوەدەدا.

بێ شعووری تەواو (شەش دانگ) لەناو بێ شعوورەکان دا، وەك گەردەلوول لە مابەین باکانە. ئەم جۆرە بێ شعوورانە زەرەر و زیانیان لە هەمووان پترە. هەر ئەو کەسانەی کە وێنەکەیان لە تەلەفزیۆندا وەك بەدفەڕ و جەنایەتکار بڵاو دەبێتەوە. بێ شعووری شەش دانگ سەرچاوەی تووڕەیی و هەیەجان و وێرانییە، بەجۆرێك کە لە تەلەفزیۆنیشدا دەیانهەوێ زەرەر بە خەڵك بگەیەنن. شارەزایی ئەم بێ شعوورانە، لە ناوبردنی کەسایەتییە، هەرچەند لە زەمینەکانی دیکەشدا توانایی ئەوەیان هەیە کە وەڕەزکەر، بێ ڕەحم، تووڕە و چەوسێنەر بن.

جان کاری بۆ بێ شعوورێکی شەش‌دانگ دەکرد. ڕۆژێك پێی گوتبوو دەبێ هەتا کۆتایی ئەم حەوتوویە ڕاپۆڕتێك لە سەر کارەکانت ئامادە بکەی و بۆ حەوتووی داهاتوودا نیشان خەڵکی بدەی. ئەو پشوودانی ئەم حەوتوویەی بۆ ئەم ڕاپۆڕتە تەرخان کردو لە سەر مێزەکەی بەڕێوەبەری دانا. دوای پێنج خولەك بەڕێوەبەرەکە پەیوەندی لەگەڵ گرت. بەڕێوەبەر بە سەریدا گوڕاندی: «ئەم ڕاپۆڕتە دەبوو هەتا ڕۆژی هەینی ئامادەبێ. تازە بۆ چیمە».

جان گوتی: «بەڵام تۆ گوتت ئەمڕۆ بیهێنە».

بەڕێوەبەر پرسی: «یانی من هەڵە دەکەم»؟

جان وڵامی داوە: «نا، مەبەستم ئەوەیە کە لەوانەیە لە قسەکانت حاڵی نەبوو بێتم».

بەڕێوەبەر بە گژیدا چوو «ئیدی دووپات نەبێتەوە». و گووشییەکەی دانا. جان حەولی دەدا ئەرکەکانی بە باشی ئەنجام بدا. بەوحاڵەش بەڕێوەبەری ڕازی نەدەکرد. ئەگەر کارەکەشی بە دروستی ئەنجام دابا، لە بەڕێوەبەرەکەی دەترسا. سەرەڕای ئەوانە بۆ دوو کار پێویستی بە جان بوو، کاری خۆی و ئەو کارانەی جان بەڕێوەی دەبرد. باشترین ڕێگەچارە ئەوەیە کە کارمان بە بێ شعووری شەش‌دانگ نەبێ! ئەگەر ئەوەش جێبەجێ نەبوو ڕێگای جان بگرینەبەر: یانی ڕەفتارێك بەوپەڕی تێبینییەوە. بیر لەوە مەکەنەوە کە بێ شعوورەکان هێز و تواناییان کەم بێتەوە یان پیر بن و وردە وردە لەناو بچن. ئەوانە بنەمایەکی بەهێزو

تۆقێنەریان هەیە. سەرئێشە یان برینی گەدە ناگرن. بەڵکوو بۆخۆیان بەدیهێنەری ئەو نەخۆشیانەن! دەڵێی لە پۆڵا ساز کراون. هێندێك دەڵێن: «خودا ئەوانی ناهەوێ و شەیتانیش ناوێرێ لێیان نزیك بێتەوە و کەوایە ئێمە کەوتووینەتە داویان.

دەستەیەکی دیکە لە بێ شعوورەکان، بێ‌شعوورێکی تاو ـ تاون. ئەم مرۆڤانە وەکوو شنەبان ڕۆژی وایە گەرمە، بەڵام ڕۆژی‌وایە ئەوەندە توندە کە کڵاوەکەت دەبا. ئەوان دەتوانن دراوسێ و هاوکارێکی باش بن و دەزانن چۆن بە بەزەیی، دلۆڤانی، ئاکاری باش و یارمەتی دان لەگەڵ خەڵك هەڵس‌وکەوت بکەن. هەڵبەت ئەگەر بیانهەوێ و بە قازانجی خۆیان‌بێ. کاتێك دنە بدرێن یان لە بارودۆخێکی ڕەوانی و دڵەتەپەدا بن، بێ‌شعوورییەکەیان فیشقە دەکا. بەڵام لە کاتەکانی دیکەدا لە مرۆڤێکی ئاسایی دەچن.

ئێدیت نموونەیەکی کلاسیك لەم چەشنە بێ شعوورییە بوو. دایکێك کە دەیتوانی لە بەرانبەر گوشاری ڕەوانی‌دا خۆی ڕابگرێ و لە هەر بارودۆخێکدا ئەرکی دایکێتی ئەنجام بدا. ئەو منداڵەکانی لە نازو دڵنەوای‌دا بارهێنابوو، بەڵام ئاخری ڕۆژێك ڕقی هەستا. سێ‌جار بە منداڵەکانی گوتبوو ئامرازی گەمەکان کۆ بکەنەوە، بەڵام دوای چەند خولەك کەرەستەی گەمەکان هەروا بڵاو ببوونەوە، ئەو (دایکی منداڵەکان) هەموویانی کۆ کردەوە و لە بەرچاوی منداڵەکان بە ڕێکخراوەی خێرومەندی بەخشی. بەئەنقەست لە بەرچاوی منداڵەکان

ئەوکارەی کرد، منداڵەکان هەتا چوار ڕۆژ گریان بەڵام بە بای خەیاڵیدا نەهات. ئێدیت گوتی: دەبێ بۆ کڕینی کەرەستەی گەمە پارەکانتان کۆ بکەنەوە. تا ئێستا کەس نەیدیوە منداڵێکی سێ ساڵە پارەی هەبێ.

ڕاهاتووترین چەشنی بێ شعووری، بێ شعووره لە بنەوە بڕەکانن. هەڵبەت مەبەست ئەوەنییە کە مەترسیان لەوانیتر کەمترە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە ئەوەندە لە بەرچاو نین. بێ شعووری لە بنەوەبڕ سەبارەت بە هەڵوێستی کۆمەڵگا بە دلۆڤانی و لەسەرەخۆیی کارەکان ئەنجام دەدا، بەڵام لە هەمان کاتدا دەزانێ چۆن لە کاتی پێویستدا زەربەی خۆی بوەشێنێ بەبێ ئەوەی کەس تێ بگا.

لەوانەیە کەسێك چەند ساڵ لەگەڵ بێ شعووری لە بنەوە بڕ بێ، بەڵام هەست بە بێ شعووری ئەو نەکا. ئەوان بەڕواڵەت مرۆڤێکی خاوەن بەزەیی، ڕۆح سووك، قسەخۆش، بەخشەندە و تەنانەت خۆبوێر لە کاری ناشایستە دێنە بەرچاو. بەڵام لەڕاستی دا ئەو تایبەتمەندییانە بۆ فریودان و ڕاکشانی سەرنجی خەڵکە و لە پشت ئەوانەوە بە نهێنی کار دەکەن.

بێ شعووره لە بنەوە بڕەکان بە شێوەی بێ دەسەڵات ـ بە کار ئیش دەکەن. ئەوان زۆرتر بە خۆگێل کردن و خافڵاندن، ژاری خۆیان دەڕێژن. بەجۆرێك لە کارو ئەرکەکانیاندا تووشی هەڵە دەبن کە زیان بە ئێوەش دەگا. لە لایەکی دیکەوە بەجۆرێك خەمخۆری دەکەن کە پێت وایە دایکی تریزان، بەو جیاوازییە کە یارمەتیتان ناکەن.

دوکتۆر رۆید لە کتێبی «ئەو بێ شعوورانەی لەگەڵ ئیمەن»دا دەنووسێ:

«زیان و زەرەر و ئازاری خەڵك لەلایەن بێشعوورەکانەوە بابەتێکی خۆڕسکە و کەس دەستووریان پێ نادا. بۆ ئەنجام دانی ئەمکارە پێویست ناکا درۆ بکەن. فرو فێڵ بکەن. تووڕە بن یان کێشە سازبکەن، بەڵکوو ئەگەر لە بارودۆخێکی نالەباردا وێڵتان بکەن، یان بە شێواندنی هزری کەسێك، دەتوانن بە ئامانجی خۆیان بگەن.

بێ شعووره لەبنەوە بڕەکان دوو جۆرن: ڕووخۆش و ڕووگرژ. بێ شعووری لەبنەوە بڕی ڕووخۆش، بۆخۆی هونەرێك بەهەژمار دێ. ئەم بێ شعوورانە لە بەرچاوی ئێوە شیرین و زمان لووسن. جاری وایە ئەوەندە زمان لووسن کە پێتوایە فڕوو فێڵێك لەکاردایە، هەرچەند لە ڕاستیدا هەیە! سەبارەت بە ناکامی و ئەو ڕووداوانەی بۆتان دێتە پێش هەڵوێست دەگرن و ناراحەت دەبن. هەڵبەت ئەوە ڕواڵەتی بابەتەکەیە و لە ڕاستیدا بە شکست و ناکامی ئێوە خۆشحاڵ دەبن. بەڵام ئەمشێوازە واتە خەمخۆرییە، وردە وردە واتان لێدەکا کە بۆ هەمووشتێك تەنانەت دەنگی مەلەکان، شەلینی قالۆنچەی حەمامیش دەگرین و ئەوەندە بێهێز و بێدەسەڵات دەبن کە بۆ هەمووشتێك پێویستیتان بەوان دەبێ.

بێ شعووری ڕووخۆش زیاتر لە شوێنی روحانی و ئایینی دا پەیدا دەبێ. قەشەیەك بە ناوی باب ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕاینەوە:

بڕیار وابوو باب کۆبوونەوەیەك لەگەڵ ئەندامانی کەلیسا پێك بهێنێ، بەڵام دواتر بۆ ناوەندی کڕینی شار بانگهێشت کراو لە کۆبوونەوەیەك دا

بەشداری کرد کە تۆسقۆف بۆ ئاوارەکان پێکی هێنابوو. ئەو جێنشینی خۆی واتە کارۆلین تیتزورسی ناردبوو، یەکێك لە ئەندامەکان سەبارەت بە نەهاتنی باب گازەندەیی کرد. وەڵامی ئەو هەر ئەوە بوو کە لە بێ شعوورێکی ڕووخۆش چاوەڕوان دەکرێ: «ئێمە دەبێ دۆعا بکەین باب زوو بگەڕێتەوە»

دواتر ئەم تانەو تەوسەیان بە گوێ دا داوە. ئەو داوای لێبووردنی کرد و گوتی هیچ مەبەستێکم نەبووە و بابەتەکەیان خراپ لێك داوەتەوە. ئەو بە ڕووخۆشی گوتی: «من گوتم دوعا بکەین ئێوە زووتر بگەڕێنەوە».

بێشعووری لەبنەوە بڕی ڕوو گرژ وەکوو پشیلە هەتا لە سەر کۆشی مرۆڤەکانن زۆر دۆستانە و ژیکەلانە تەنیا مرخەمرخیانە. بەڵام ڕەگەڵ ئەوەیکە چوونە حەوشە و حەسار دەسبەجێ دەبنە دڕندەیەکی خوێنمژ و ئەم دوو تایبەتمەندییە جیاوازە و دوولایەنەیە، سەرسووڕهێنەرن.

ئەم بێ شعوورانە بەخیلی بەوە دەبەن کە کەسێك لەوان لێهاتووتر و سەرکەوتووتر بێ. لە ئاکام دا بەڕواڵەت هێدی و لەسەرەخۆن و لە دەروونەدا وەکوو مەنجەڵێك دەکوڵێن و لە سازکردنی ناکۆکی و دووبەرەکی ناترسێن. بە ڕواڵەت خەریکی یەکێتی و کۆبوونەوەی بنەماڵەن، بەڵام لەڕاستیدا زۆر لێزانانە بە قازانجی خۆیان ئاقاری بنەماڵە تێکدەدەن و کارێکی وادەکەن کە برا دژی خوشك. باوك دژی کوڕ و مام دژی برازا هەڵوێست بگرن و هەموویان ببنە دوژمنی یەکتر.

ئەوان خۆیان بە بەرگری ئاکار و داوێن‌پاکی دەزانن و بەردەوام سەبارەت بە بابەت گەلی ورد و کەم بایەخ هەڵوێست دەگرن. کەوایە، سەرچاوەی غەیبەت و خراپەبێژین و سەرەڕای ئەوانە قەبووڵی ناکەن کە پاشەملە قسە دەکەن و زۆرجار لە بەر چاوی خەڵك گاڵتە بە ئابڕووی خەڵك دەکەن.

بێ شعوورە لەبنەوە بڕەکان بەجۆرێك خۆیان دەنوێنن کە پارێزەر و بەرگری پاقژی و داوێن پاکین، بەڵام ئەم قیافە گرتنانەش بۆ فریودانی خەڵکە. دۆزینەوە و چاك‌سازی تاوانەکان و هەڵەکان کەرەستەیەکە بۆ هەڵداشتنی بیرو ڕای گشتی، بۆئەوەی هەڵەی خۆیان لە بیر خەڵك بەرنەوە.

ئەگەر قازانجی بێ‌شعوورێك لەگۆڕێدا بێ ئەوا دەتوانێ چەند ساعەت سەبارەت بە مرۆڤایەتی و بەخشین قسە بکا، بەڵام خودا نەکا تەنیا جارێك داوای لێبوردنیان لێ‌بکەی. لێرەدا چەند مانای نوێ بۆ بەخشین فێر دەبی. مانای وەك پلارتێ گرتن و جنێو و قیڕەو هەرا.

حەول و تەقەللا بۆ شرۆڤەکردن و دەستەبەندی ڕادەی بێ شعووری نابێ ببێتە هۆکاری بەکەم زانینی هەرکام لەوانە یان وابزانین کە بێ شعوورەکان هەمیشە لە چوارچێوەیەکدا کار دەکەن. لەوانەیە بێ شعوورێکی تەواو، سەرەڕای هەبوونی پیشەی باش و بنەماڵەی باش، وەکوو مرۆڤێکی بەئاوەز کار بکا و لە دەستەی بێ شعووری تاو ـ تاودا بێ. لەوانەیە بێ شعووری لە بنەوە بڕیش ڕووگرژ بێ. کەوایە باسی ڕادەی بێ شعووری بابەتێکی گرینگە، چونکە کاتێك گوێمان لە وشەی «بێ‌شعوور» دەبێ تەنیا بێ شعووریی تەواو بە زەینمان دەگا. ئەم بابەتە ناهێڵێ بێ‌شعووری

تاو ـ تاو و لە بنەوە بڕ دیاری بکەین و بیناسین یان هێندێك لە مرۆڤەکان نازانن کە بۆخۆشیان بێ شعوورن. بێ شعوورەکان خووخدە و شێوازەکانیان وەك یەك نیە. بەڵام ئامانج و پێکهاتەی کەسایەتیان وەك یەك وایە. هەرچەند لەوانەیە کەرەستەو شێوازی گەیشتن بە ئامانجیان تۆفیری هەبێ. ڕەنگە ئەم بابەتانە گرینگ نەبێ، بەڵام ئەگەر دەستەبەندییان نەکەین قەت ناتوانین چارەسەریان بکەین. بە قەولی یەکێك لە بێشعوورەکان: «ئەگەر بەشێك لە ڕێگە چارە نیت. لەوانەیە بەشێك لە بابەتەکە بی». تەنیا بێ شعوورێك لەم قسەیە حاڵی دەبێ کە ئێستە قۆناغی دەرمان کردن تێپەڕ دەکا.

چالاکییەکان

١ ـ ئێوە کام یەك لەو بێ شعوورانەن؟

٢ ـ تا ئێستا لەدەست بێ شعوورێکی شەش دانگ وەڕەز بوون؟

## بابەتی شەشەم:

## بێ شعووریی کۆمەڵایەتی

«جاری وایە لە نیوە شەودا وەخەبەر دێم و لە خۆم دەپرسم کە بێ شعوورەکانیش لە کاتی گۆڕانی مرۆڤەکان، لە سەر ئەم گەرۆکە پێکا هاتوون؟ یان لە گەرۆکێکی دیکەی وەک ئۆرانووسەوە هاتوون»؟

ئەریکا . قوربانی بێ شعووریی بنەماڵەیی.

نەخۆشی بێ شعووری لە بواری فەرهەنگییەوە جۆراوجۆرە. بەداخەوە لە تەواوی سەرچاوەکاندا، باسی بێ شعووری بە تاوتوێکردنی بێ شعووری تەواو کورت دەبێتەوە و هەرئەوانە لە بارودۆخی وەک کار، نارەزایەتی کۆمەڵایەتی، دەوڵەت و بیر و باوەڕەکاندا شرۆڤە کراون. هەڵبەت ئەم بابەتانە گرینگن و لە بەشەکانی دیکەدا باسیان دەکەین، بەڵام نابێ بێشعووری کۆمەڵایەتی لە بیر بکەین. ئەوانە هەر ئەو بێ شعوورە ئاساییانەن کە لە پیادەڕۆکان، شەقامەکان، سینەماکان و میوانی بنەماڵەکان و تەنانەت لە سەر پێخەفی ئێمەشدا دەبینرێن.

هەرچەند جاری وایە دیاریکردنی بێ شعووریی کۆمەڵایەتی لە تاکی ئاسایی دژوارە. یەکەم هۆکاری ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئەوان لاسایی مرۆڤێکی ئاسایی دەکەنەوەو ئێمەش باوەڕ دەکەین. ئەوان بە لێزانی لە پشت داب ونەریتی کۆمەڵایەتی خۆیان دەشارنەوە و حاڵیمان دەکەن کە هەرچەند کارەکانمان تایبەتن، بەڵام وەک مرۆڤێکی ئاسایی وایە. بێ

شعووره کۆمەڵایەتییەکان بە دلۆڤانی و لێهاتوویی هەستی خەڵك دەبزوێنن و ئەوەش لە سەر پێناسەکردنیاندا کاریگەری هەیە. بۆ وێنە:

١ ـ لەوانەیە خزم وکەسی ئێمەبێ و پێمانخۆش نیە قەبووڵی بکەین. جگە لەوانە کەس بۆی قەبووڵ ناکرێ دایکی بێ شعوور بێ.

٢ ـ لەوانەیە باشترین دۆستی خۆمان بن و بۆمان قەبووڵ ناکرێ کە ئەو هەڵە گەورەیەمان کردبێ. کەس پێی خۆش نییە کە بزانێ لەگەڵ بێ شعوورێك زەماوەندی کردووە.

٣ ـ پێمان خۆشە، وا بیر بکەینەوە کە زۆربەی خەڵك ئاسایی و عاقڵن. هەڵبەت ئەزموونەکان نیشانیانداوە کە زۆرینەی خەڵك بێ شعوورن. بەڵام تازە ئەم بیرۆکەیە کە ئێمە بەرەو تەواوکاری و بێکەم و کووڕی دەچین و بەشەر ناگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەیموون، ئاوێتەی زەینی خەڵك بووە.

سەرەڕای ئەوانە زۆرجار گوتوومانە فڵان کەس بێ شعوورە. بۆ وێنە: مامت بێ شعوورێکی شەشدانگە، کوڕی مامت شعووری نییە. بەڕێوەبەری سینەما بێ شعوورێکی تاوتاوە (پارەکە لە سینەما بووم چەند کەس لە پشت منەوە قسەیان دەکرد پێی وابوو منم و دەری کردم. بەڵام دواتر زانی هەڵەی کردووە بە خۆڕایی بلیتێکی بۆ ناردم). کارمەندی ئیدارەی پۆست بێ شعوورێکی لەبنەوە بڕە، مامۆستای کوڕەکەم بێ شعوورێکی ڕووخۆشە...

توێژینەوەکانم نیشان دەدا کە کۆڕ و کۆبوونەوە و بارودۆخی بنەماڵەکان باشترین شوێنە بۆ پەرەساندنی بێشعووریی، بەتایبەت ئەو کۆبوونەوانەی

کە مامەکان و خاڵەکان، پوورەکان و دایەگەورە و باپیرو منداڵەکان کۆدەبنەوە و جاری وایە بیست‌و پێنج ساڵ چاویان بە یەکتر ناکەوێ. دانانی ئاوا کۆبوونەوەیەك بیرۆکەی بێ شعوورییەکی بێکارە کە پێی وایە خزم و قێڵەکان لەمێژە یەکتریان نەدیوە و دەبێ کۆببنەوە. هەموومان دەزانین هۆکاری ئەم چاوپێکەوتنانە چییە، بەڵام کەس زاتی ئەوەی نییە باسی بکا. کەوایە حەفتا هەشتا کەس کە هیچ خاڵێکی هاوبەشیان نییە. پێکەوە ماوەیەکی ناخۆش و وەڕەزکار ڕادەبوێرن هەتا دوو بێ شعووری شەش‌دانگ هەست بە دەسەڵات و گەورەی بکەن .

نموونەیەکی دیکەی ئەم سیناریۆیە لە بۆنەکانی وەك جێژنی لەدایکبوون و سەری ساڵ بەڕێوە دەچێ. هی‌وایە بۆ ڕۆژی لەدایك بوونی منداڵەکەی خەڵك دەعوەت دەکاو تەواوی خزم‌و کەسەکانی ئاگادار دەکاتەوە و زۆرجار عوزرمایی کەس قەبووڵ ناکا. ئەوانە نموونەیەکی کلاسیکن لە بێ شعووری. ئەو بێ‌شعوورەی میوانی پێك‌دەهێنێ، لەڕاستیدا دەیهەوێ سەرتری و بڕشتی خۆی زیاتر بکا.

ئەگەر بە زمانی خۆش نەتوانێ بنەماڵەکان کۆبکاتەوە. خێرا دەست بە هەڕەشە و گوڕەشە دەکا و خزم‌و کەست لێ‌فێر دەکا و گوشارت بۆ دێنن و ناچارت دەکەن لە جێژنی لەدایك‌بوونی باوکی بەشداری بکەی. دواتر پارەکانیان کۆدەکەنەوە هەتا دیارییەکی گرانبایی بکڕن. دیارییەك کە نە ئێوە پەسەندی دەکەن نە بەکەڵکی باوکی دێ. بەوحاڵەش ناچارن پێبکەنن و بەشێك لە پارەی خۆتان بکەنە دیاری، دەنا دەبێ بە گاڵتەجاڕی

ئەوانی تر و بە چاوێکی سووکەوە چاوت لێ دەکەن. تەنانەت ئەگەر بە تەنیا دیاری بکرێ.

تەنیا ئامانجی ئەم کۆبوونەوانە ئەوەیە کە: کەسێك دەیهەوێ بە بیانووی داب و نەریتەکان بەسەر بنەماڵەکاندا خۆی بنوێنێ. ئەندامانی بنەماڵە دەزانن کە بنەمای ئەم کارانە بێ شعوورییە. بەڵام بەدەگمەن هەڵدەکەوێ کە کەسێك لە بەرانبەر بێ شعووری کۆمەڵایەتیدا ڕاوەستێ. لە ڕاستیدا جاری وایە هێندێك لە ئەندامانی بنەماڵە بۆ سەرکەوتوویی ئەوان دوعا دەکەن. کەوایە هۆکاری بەردەوامی ئەم بێ شعوورانە ئەوەیە کە کۆمەڵێك بە خواست و ویستی خۆیان ئەم بارودۆخە قەبووڵ دەکەن. چونکە بەگشتی تاکی ئاسایی سەرئێشە بۆ خۆی دروست ناکا. لە ئاکامدا بێ شعووریی ئەم بێ شعوورانە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ پەرەدەستێنێ و سەقامگیر دەبێ.

ئەم بێ شعوورانە بە لێزانی و لێهاتوویی تایبەت داب و نەریتی دوولایەنە و سێلایەنە بەکار دەبەن و خەڵك گێژو حەیران دەکەن و یاسا و ڕێسایەك دادەنێن کە بۆخۆشیان قەبووڵیان نییە. هەروەها ئەوە خەیاڵێکی خاوە کە پێتان وابێ بە مردنی یەکێك لە بێ شعوورەکانی گەورەی بنەماڵە لەکۆڵتان دەبنەوە، ئەمجۆرە مرۆڤانە دوای مەرگیش بەرۆکتان بەرنادەن. پرۆتێلا وورتینگتۆن قەبرهەڵکەنی ئینگلیزی، لە کتێبی شەست ساڵ لەناو مردووەکاندا دەڵێ کە بێ شعوورەکان دوای مردنیشیان هەروا بێ شعوور دەمێننەوە. بۆخۆم مامێکم هەبوو کە زۆرجار لە کاتی نالەباردا بە شکلی ڕۆحێکی سەرگەردان خۆی نیشان دەدا و هەموو جارێ بەشێك

لە ئەندامی لەدەست دەدا. ئاخری هەموو شتێکی لەکیسدا و تەنیا بێ شعووری بۆماوە. هیچ بەڵایەك لە بێ شعووری ماڵ وێرانکارتر نییە.

چالاکییەکان

١ ـ چەند بێ شعوور لە خزمە نزیکەکانت ناو ببە. چ تایبەتمەندییەکیان هەیە؟

٢ ـ جاروبارە دۆستێکی بێ شعوور هەڵدەبژێری، هۆکاری ئەم هەڵبژاردنە چییە؟

## بابەتی حەوتەم:

# بێ شعووری لە بازرگانی دا

«دڵێکی گەورەم هەیە. ئەوەندە گەورە کە جێگای تەواوی پارەی دنیای دەبێتەوە».

بێرنارد گرۆفیشتاین . بێ شعوورێك کە ئێستا قۆناغی دەرمان کردن تێپەڕ دەکا

پیشەسازی و بازرگانی بەشێك لەو پیشانەن کە بێ شعوورێکی زۆر ڕووی تێدەکەن. هۆکارەکەشی ئاشکرایە: بێ شعوور عاشقی پارە، دەسەڵات و ڕەکەبەرایەتییە. بەڕێوەبەرایەتی کەرەستەیەکە بۆ دەسەڵاتداری بێشعوورەکان. لە ڕاستیدا، مێژووی بازرگانی لێوان لێوە لە بێ شعوورەکان. تۆمارێکی پاپیرووسی لەناو گڵکۆی فیرعەونییەکاندایە کە لەودا ئاماژە بە بابەت گەلی وەك سەرکەوتن سەرەڕای ژینوساید و بێ شعووری یەك خولەکی کراوە .

لە نووسراوەیەکی کەونارادا بە ناوی بەڕێوەبەرایەتی جەنگیزخانی مەغوول ئاماژە بە چوار قۆناغی گەیشتن بە پلە و پایەی «ئیلخانی بێ شعوورەکان» کراوە.

١ ـ تەواوی ڕەقیبەکان لەناو ببە ٢ ـ هەموو هێز و دەسەڵاتەکان بۆخۆت وەرگرە ٣ ـ ئامانجی ڕاستەقینەی خۆت لەناو چوارچێوەیەك لە درۆ و کەڵەك بشارەوە ٤ ـ بەجۆرێك کار بکە کە کەس سەری لێ دەر نەکا.

هەروەها ناتوانین لە کاریگەری چاوبادامییەکان بەسەر فەرهەنگی بازرگانی ڕۆژاوا چاو بقووچێنین. لەوانەیە بێ شعووری بازرگانی لە ڕشتەی خۆیدا کارامە بێ، هەرچەند بێ شعوورەکان لە وەرزشی گرووپی دا جوان کایە دەکەن و هەمیشە یاریان کردووە.

بۆ کاسبکارو بازرگانێکی ئاسایی و عاقڵ، ڕەکەبەرایەتی بزوێنەرێکی بەکەڵکە. بەڵام بۆ بێ شعوورێك شەڕ و خوێن ڕشتنە. وەکوو ڕامبۆ یەدان بەهەژمار دێن. هەموو شتێکیان بۆخۆیان دەوێ و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بێ بەزەییانە کار دەکەن. بەو حاڵەش قەت لە دەسکەوتی خۆیان چێژ وەرناگرن. چونکە ئەگەر بۆ ساتێك پشوو بدەن بێ شعوورەکانی دیکە دەردیسەرییان بۆ سازدەکەن و کارەکەیان لەدەست دەدەن. ئەوان نەتەنیا دەیانهەوێ براوە بن، بەڵکوو هەتا ڕەقیبەکەیان لەناو نەبەن دەست هەڵناگرن.

کەوایە مرۆڤی عاقڵ بایەخی دەسەڵات دەزانێ و بە تێگەیشتوویی کەڵکی لێ وەردەگرێ. بەڵام بێ شعووریی بازرگانی تەنیا بۆ خۆنواندن و لاساری کەڵکی لێوەردەگرێ. لەخۆبایی و خۆبینی بێ شعوور زۆرە، بەڵام خۆبینی بێ شعووریی بازرگانی بە ئەندازەی پاپۆڕێکی گەورەیە و بە هەمان ئەندازەش پێویستی بە خزمەتکار و ژێردەستە. بێ شعوورەکان لە هێز و دەسەڵاتیان کەڵك وەردەگرن هەتا بەڕێوەبەرایەتی خۆیان نیشان بدەن. کارێك کە ئامانجی لەناوبردنی مرۆڤی لاسار، بەکرێ گیراوی ئەمەك نەناس، بەشەڕهاتن لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی دیکە و گوشار بۆ

ژێردەستەکانە. بێ شعووری بازرگانی لەگەڵ کارمەندەکانی وەکوو کۆیلەیەکی ئەفریقایی هەڵس وکەوت دەکا و بایەخ بۆ کڕیارەکانی دانانێ و دروشمەکەیان ئەوەیە: ((حەق بە کڕیار نییە. مەگین کڕیارەکە بۆخۆم بم)).

بازرگانی بەشەڕەف، بێ غەل و غەش کار دەکا و شتی شاراوەی نییە، بەڵام بێ شعوور لە خەویش دا خەریکی فێڵ و تەڵەکەیە. بەڕای ئەو بازرگانی وەکوو کایەی پووکێر وایە و تەواوی کارەکان بە درۆ و دووڕوویی بەڕێوە دەچێ، وەکوو شەڕی چەکداری کە لەپێش هەمووشتێکدا نارنجۆکێکی دووکەڵکەر دەتەقێنن و خۆیان لە دوژمن ون دەکەن. کتێبی پیرۆزی ئەم بێ شعوورانە کتێبێکە بە ناوی هونەری دزی (دۆناڵد کرامپ) کە دەنووسێ: ڕاستی و دروستی، بێ مانایە. باشترین ڕێگەچارە لە بازرگانی دا، بەڕێوەبەری لە دەست تێوەردانی ژمارەکانە. بۆ دەبێ بۆ بەدەست هێنانی شتێك ئەوەندە خۆمان تووشی دەردیسەری بکەین، کاتێك دەتوانین بیدزین ؟

دیارە کاتێك کەسێك بیهەوێ بەو هەمووە کەم و کۆڕی و کەمایەسییەوە لە کۆڕ و وتووێژەکاندا کار بکا. دەبێ کەمایەسییەکانی بە ساختەچێتی، زمان لووسی و شات و شووت کردن قەرەبوو بکاتەوە. لێرەدا بێ شعووری قسەزل پەیدا دەبێ. ئەوان دەزانن کە قیافەگرتن لە شوێنی کار ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە.

ئەم بێ شعوورانە لە دنەدانی خەڵك (قسەی بێتام). داهێنەری (دزینی بیر و بـاوەڕی خـەڵك). هاوكـاری (تۆقانـدنی خـەڵك)و بەڕێوەبەرایـەتی (شاردنەوەی كارە خراپەكانیان) خۆیان بە پسپۆڕ دەزانن.

بەرچاوترین چەشنی بێ شعووری بازرگانی، بـێ شـعوورەكانی MBA كورت كراوەی دەستەواژەی «پسپۆڕ و كارامە لە بێ شعووری دا».
(Master of Being an Asshole) ئەوانە كەسانێكن بە بیرۆكە و بڕوای جۆراوجۆر كە ئاوەزیان كەمە. كەسانێك كە بە بڕوانامەی بێ ناوەڕۆك بۆ هەر بابەتێك وڵامێكیان (نەك ڕێگەچارە) پێیە.

بێ شعوورەكانی MBA دەستێكی باڵایان لە دانانی كۆبوونەوەی دوور و درێژ و ماندووكەردا هەیە كە لەودا هەژماری بەشداربووان، بەرهەم و دووكانەكان گرینگیان پترە. هەڵبەت بارستایی گۆڕینەوە لە بازرگانیدا زۆرە و ساڵانە هەژمارێك لە بێ شعوورە بازرگانییەكان وەبەر ئەم شەپۆلە دەكەون و لە مەیدان دەچنە دەرێ. هەرچەند بە یەكجاری لەناو ناچن و دوای ماوەیەك بە ناوێكی تازە وەك «ڕاوێژكار» پەیدا دەبنەوە.

چالاكییەكان

١ - بۆ كام بێ شعووری بازرگانی كار دەكەی؟

٢ - لە شەش مانگی ڕابردوودا چەندجار فێڵی لێ كردووی؟ لە شەش ڕۆژی ڕابردوودا چەند؟ لە شەش خولەكی ڕابردوو چەند؟

## بابەتی هەشتەم:

### بێ شعووریی مەدەنی

«ئەگەر لانیکەم حەوتووی جارێك لە ناڕەزایەتی مەدەنی دا بەشداری نەکەم، تووڕە دەبم. هۆکاری ناڕەزایەتییەکە گرینگ نییە. گرینگ ناڕەزایەتیکردنە کە بۆ ئەو دەژین».

هێنریتا براون. بێ شعوورێکی چالاك کە ئێستا قۆناغەکانی دەرمانکردن تێپەڕ دەکا.

ئەمڕۆ ناڕەزایەتی مەدەنی باوە و جاران خەڵك بۆ ئازادی و مافی خۆیان ناڕەزایەتیان دەردەبڕی، بەڵام ئێستا خەڵکێکی زۆر لە ئازادی و مافی خۆیان بۆ ناڕەزایەتی کەڵك وەردەگرن. ئەوان بەردەوام خەریکی ناڕەزایەتی و دروشمدانن. پێیان وایە دروشم دان لە دۆزینەوەی ڕێگە چارە گرینگترە. زۆربەیان بە دانی دروشم کە بۆخۆشیان باوەڕیان پێی نییە، چالاك دەبن. هەڵبەت ئەکتیو لە بێ شعووریدا.

پیتر لیلی لە کتێبی هاواری بێ شعوورەکان دا بنەمای چالاکی مەدەنی بێ شعوورەکان، لە نەرە و گوڕەی سەردەمی بەرد تا بۆمب ڕێژی ئانارشیستی سەدەی نۆزدە، تا بزاڤی ناڕەزایەتی ئێستا تاوتوێ دەکاو دەیدۆزێتەوە. ئەو ئاگادارمان دەکاتەوە کە بێتوو بزاڤی ناڕەزایەتی بە مافی مەدەنی ئەوان لەقەڵەم بدەین، ئەوا مەترسییەکی گەورە هەڕەشەمان لێ دەکا: کۆمەڵگا خەریکە بێ شعووریی لە باوەش دەگرێ.

ئەم هەڕەشانە زۆر شتی وە دەرخست. زۆرێک لەو کەسانەی دێنەلام و دەڵێن «من بێ شعوورم» لە خۆپیشاندان و بزاڤی ناڕەزایەتی دەیەی ۱۹۶۰ بەشدارییان کردووە. داخوازی و دروشمی ئەم مرۆڤانە تەنیا بۆ ئازادی بووە. بەڵام دواتر فێربوون کە بە دروشم و ناڕەزایەتی خۆیان لە ژێر ئەرکی زەماوەندکردن، پیشە، ماڵ و ڕێزدانان ڕزگار بکەن. هەڵبەت ئەم بابەتە تەنیا هۆکاری بەدیهاتنی بێ شعووری نییە، بەڵکوو «هەیەجانی ناڕەزایەتی» هۆکاری سەرەکییە. بۆ وێنە کەسانێک هەن کە لەو هەیەجانە چێژ وەردەگرن یان کەسانێک کە پەڕاوێزی یارمەتی بە داماوەکانیان لە چاکەکاری پێباشتر و سەرنج ڕاکێشترە.

ڕەنگە بێ شعووری مەدەنی مەترسی دارترین چەشنی بێ شعووری لە کۆمەڵگای مەدەنی بێ. ئەم بابەتە لە بەر خراپەکاری و ئاژاوە نانەوەی ئەوان نییە، ـ هەڵبەت هێندێك هەیانە ـ بەڵکوو لەبەر ڕادەی گیرۆدەیی و گوێزانەوەی بێ شعوورەکانە. هەروەك ئادۆلۆڤ ئیشنایدێر لە کتێبی ئەو بێ شعوورانەی من ناسیومن ئاماژە بەوە دەکا: «لەڕاستیدا هیتلێر لە شەڕدا سەرکەوتوو بوو، نەك شەڕی چەکداری، بەڵکوو لە فریودانی خەڵك. ئەو تۆویی ئەو نارازیانەی چەقاند کە نە ئاوات و چاوەنواڕیان کۆتایی دێ و نە کەس دەتوانێ پێش خۆبینی و داخوازییەکانیان بگرێ. بەم جۆرە فاشیزم لە جەستەی بێ شعووری مەدەنی و بە شکڵی ناڕەزایەتی مەدەنی درێژە بە ژیانی خۆی دەدا».

ئەمە یەکێك لەو هۆکارانەیە کە لە کۆمەڵگای ئورووپایی دا نارەزایەتی مەدەنی لە چاو ئامریکا زیاتر جێی خۆی کردۆتەوە. هەرچەند ئامریکاش دیبهەوێ کەم کاری ڕابردووی قەرەبوو بکاتەوە. کەوایە ئورووپاییەکان ـ زیاتر لە خەڵکی دنیا ـ لە بێ شعوورەکان بێزار بوون.

پێنج تایبەتمەندی بێ شعووریی مەدەنی ئەوانەن:

١ ـ بێ شعووریی مەدەنی بە شێوەی یەكلایەنە بابەتەکان تاوتوێ دەکا. ئەو شێوازەی کە قازانجی ئەوانی تێدابێ. هەر لە بەر ئەوە ئەو سپی پێستانەی لەگەڵ ڕەش پێستەکان خراپن ڕەگەز پەرەست بە هەژمار دێن، بەڵام ئەو ڕەش پێستانەی لەگەڵ سپی پێستەکان بەدڕەفتاری دەکەن تەنیا بە دراوسێیەکی خراپ لەقەڵەم دەدرێن. ئەو ڕەشانەی دژی سپییەکان جوداوازی دادەنێن «چالاکی کۆمەڵگا» بەهەژمار دێن و ئەو ڕەش پێستانەی بە قازانجی خۆیان دژی ئیسپانییەکان کورەی جوداوازی دادەنێن کارێکی دروست بۆ ڕەش پێستەکان ئەنجام دەدەن. بیرۆکەی یەك لایەنە سەبارەت بە فێمینیسەکان، سوورپێستەکان و نەتەوەپەرەستەکانیش بەکار دەبردرێ.

٢ ـ بێ شعووریی مەدەنی مرۆڤێکی قیناوی و بێزارکەر و ڕەش بینن. ئەوەی لەگەڵیان نەبێ بە دوژمنی دەزانن. ئەوان ڕێز بۆ بیر و باوەڕی کەس دانانێن و دەڵێن نەوەکوو لە سەر بیر و باوەڕیان کاریگەری هەبێ. هێز و توانای خۆیان بۆ نارەزایەتی و بێزاری دادەنێن و قەت لە خۆیان نەپرسیوە کە هۆکاری ئەم نارەزایەتییە چیە.

٣ ـ ئەوان مووچەیەکی تایبەت بۆ کاری ناڕەوا، ئازارگەیاندن و هەڵگیرساندنی شەڕ دادەنێن. ئەگەر ناچاربێ چەند سمۆرە بکووژێ، فیلمیان لێ‌هەڵگرە و بڵێ تەڵەیان بۆ ئەو بێ‌سەرو زمانانە داناوەتەوە، کەوایە بەرپرسی ئەم ڕووداوە دڵ تەزێنە کارخانەی تەڵە دروست‌کردنە. بەم جۆرە بۆ کارە ناڕەواکانیان بیانوو دەهێننەوە. کاتێك بێ شعوورێکی مەدەنی چالاك بێ، بەوپەڕی بێ‌شەرمی و بێ خەیاڵی هەڵس‌و کەوت دەکا.

٤ ـ ئەوان لەگەڵ خۆشیان درۆ دەکەن. لەلایەکەوە پەیرەوی لە گاندی دەکەن و لە هەمان‌کاتدا بەجۆرێك ڕق‌و بێزاری خۆیان ئاشکرا دەکەن کە لانی‌کەم گێرەوکێشە دروست بکا.

٥ ـ بێ شعووری مەدەنی هەستی قسەخۆشی و حەنەکچیان نیە. ئەگەر بە هەڵە شۆخی بە بابەتێکی بێ شعوورەکان بکەی، دەسبەجێ بێزەر و گاڵتەکارەکە بە شەیتان لەقەڵەم دەدەن. لەوە دەترسێن کە ببێتە بابەتی پێکەنینی خەڵك و بیر و باوەڕیان لەرزۆك بێ. جوولەکەکان دەتوانن شۆخی بە مووسایی بکەن و ڕەش پێستەکان دەتوانن گاڵتە بە ئەشکەوتەکانیان بکەن،بەڵام ئەگەر کەسێك ـ لە دەرەوەی ئەم چوارچێوە ـ بیهەوێ گاڵتەیان پێبکا دەسبەجێ لەناوی دەبەن.

بێ شعووریی مەدەنی تینووی دەسەڵاتە و هەتا هێز و توانای زاڵ‌بوون بەسەر خەڵك بەدەست نەهێنن، دەست هەڵناگرن. لە هەموو سەیرتر ئەوەیە کە چالاکی مەدەنی و هەستی ئازادیخوازی ئەوان، تەنیا بە

چەوساندنەوەی خەڵك - یانی خەڵك ناچار دەکەن کە پەیرەوی لە بیرو بڕواکانیان بکەن - مسۆگەر دەبێ. شێوازیان چەشنێك لە کۆیلە دارییە. ئەوەندەی ئەوان پێویستیان بە چەوسێنەرانەوە هەیە چەوسێنەران پێویستیان بەوان نییە.

یەکێك لە نەخۆشەکانم دەیگوت: «تەنیا شتێك کە بەردەوام لە ژیانم دا ئەنجامم داوە ڕق و بێزاری لە هاوسەرەکەم بووە. بەڵام ئێستا لە کوشتنی پەشیمانم و ژیان بەبێ ئەو ژیانێکی پووچ و بێمانایە. نازانم چ بکەم».

چالاکییەکان

١ - ئێوە چالاکی مەدەنین؟ کەی چالاکی مەدەنیتان دەست پێکرد؟ لەو کاتەوە ژیانتان باشتر بووە؟ یان هەست دەکەن فریویان داون؟

٢ - هەتا بۆتان دەکرێ بیر لە چالاکانی مەدەنی بکەنەوە. داخوا مرۆڤی شاد و خۆشحاڵیان تێدایە؟ چەند کەس لەوانە دارووی هێورکەر و دژی دڵەخورپێ سەرف دەکەن؟ چ وانەیەکیان لێ فێر بووی؟

## بابەتی نۆهەم:

## بێ شعووری پیرۆز ئاسا

«ئەگەر ڕۆحی مرۆڤی بێ شعوور پاش مەرگی بچێتە جەستەی بوونەوەرێکی ترەوە هەمیسان بێ شعوور دەبێ».

ڕێکس هاواك . بێ شعوورێکی بنەماخواز کە ئێستا قۆناغەکانی دەرمانکردن تێپەڕ دەکا.

ئەگەر دوایین بیانووی ڕووت و هەژارەکان نیشتمان پەروەری بێ، خودایی و ئاسمانیش دوایین بیانووی بێ شعوورەکانە. تەنانەت هێندێك پێیان وایە کە بێ شعووری خودایی و پیرۆزئاسا پووختەی بێ شعوورییە.

بەختەوەرانە هەموو مرۆڤە ئاینییەکان بێ‌شعوور نین و زۆربەیان بەپێی ڕێبازی ئاینیی کاری شیاو ئەنجام دەدەن. بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە هێندێك لە بێ شعوورە ئاسمانییەکان بە ناوی ئایین کاری ناڕەوا دەکەن. ئەگەر شتی باش، ئاینیش بێ بکەوێتە دەست مرۆڤی خراپکار بە لارێی دەبا. ئەم بێ شعوورانە لە دوو بوارەوە لەگەڵ بێ‌شعوورەکانی دیکە جیاوازییان هەیە. یەکەم ئەوەی کە بۆ تیرۆری دوژمنەکانیان هەم لە خوداو هەم لە شەیتان داوای یارمەتی دەکەن، یانی دەتوانن نزیك‌بوونەوە لە خودا و خۆلادان لە شەیتان بکەنە بیانوویەك بۆ گەیشتن بە داخوازییە نامرۆڤایەتییەکانیان. یەکێك لە نەخۆشەکانم دەیگوت: «بەڕاستی ئینسان

## بابەتی نۆهەم:

## بێ شعووری پیرۆز ئاسا

«ئەگەر ڕۆحی مرۆڤی بێ شعوور پاش مەرگی بچێتە جەستەی بوونەوەرێکی ترەوە هەمیسان بێ شعوور دەبێ».

ڕێکس هاواك . بێ شعوورێکی بنەماخواز کە ئێستا قۆناغەکانی دەرمانکردن تێپەڕ دەکا.

ئەگەر دوایین بیانووی ڕووت و هەژارەکان نیشتمان پەروەری بێ، خودایی و ئاسمانیش دوایین بیانووی بێ شعوورەکانە. تەنانەت هێندێك پێیان وایە کە بێ شعووری خودایی و پیرۆزئاسا پووختەی بێ شعوورییە.

بەختەوەرانە هەموو مرۆڤە ئاینییەکان بێشعوور نین و زۆربەیان بەپێی ڕێبازی ئاینیی کاری شیاو ئەنجام دەدەن. بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە هێندێك لە بێ شعوورە ئاسمانییەکان بە ناوی ئایین کاری ناڕەوا دەکەن. ئەگەر شتی باش، ئاینیش بێ بکەوێتە دەست مرۆڤی خراپکار بە لاڕێی دەبا. ئەم بێ شعوورانە لە دوو بوارەوە لەگەڵ بێشعوورەکانی دیکە جیاوازییان هەیە. یەکەم ئەوەی کە بۆ تیرۆری دوژمنەکانیان هەم لە خوداو هەم لە شەیتان داوای یارمەتی دەکەن، یانی دەتوانن نزیکبوونەوە لە خودا و خۆلادان لە شەیتان بکەنە بیانوویەك بۆ گەیشتن بە داخوازییە نامرۆڤایەتییەکانیان. یەکێك لە نەخۆشەکانم دەیگوت: «بەڕاستی ئینسان

*لـەخۆبایی و بـەدەمارن. پێیـان وایـە بـێ دەمـاری و بـێ فیزیـی ـ تـا ئەوکاتەی دەسەڵاتیان بەدەستە ـ وشەیەکی بێ مانایە. بـەڵام ئـەم بابەتـە بەرگری لەوە ناکا کـە سـەبارەت بـە قـازانج و پێویستی بێ دەمـار قسـە نەکەن. هەڵبەت ئەوان سـەبارەت بـە بـێ دەمـاری بۆخۆیـان قسـە ناکـەن. بەڵکوو بۆ ئێوە قسە دەکەن و بێ گومـان بـێ دەمـاری ئێـوە بارودۆخێك پێك دەهێنێ کە لە بەرانبەریان‌دا کڕنۆش بکەن و بـە گـەورەیی و شکۆی ئەوان زەرەر نەگەیەنن.

* ئەوان ڕێو شوێنی ژیانی خۆیان بە باشترین ڕێو شوێن دەزانن و ئەگەر نـاتوانن لـەم بابەتـە بگـەن واباشـە لـەناو بچـن. ئـەم مرۆڤانـە بـۆ سەرکوت‌کردنی خەڵك لە کتێبی پیرۆز کەڵك وەردەگرن و پێـداگری دەکـەن کە تەنیا و تەنیا بۆچوون و بیرتەسکی ئـەوان دروستـە و هەرکـەس شـەڕە قسەیان لەگەڵ بکا ئەوا شەیتان فریوی داون و چۆتە دەروونیانەوە.

ئەم بێ شعوورانە بە لێهاتوویی و لێزانی و بە ناوی کتێبی پیرۆز هـەموو کارێك دەکەن و لە سەر بابەت گەلێك پێداگری دەکەن و بەڵگە دەهێننـەوە کە قەت بەئیمانەکان بیری لێ‌ناکەنەوە و بێ ئیمانەکانیش لێی حاڵی نابن و ناتوانن ڕەخنەی لێ‌بگرن. وەکوو تەواوی بێ شعوورەکان بیر دەکەنـەوە و پێیان وایە بەقسەی زل و شات‌و شووت دەتوانن کارەکانیان ئەنجام بدەن.

بێ شعووریی ئاسمانی پیشـەیی لـە قسـەکردن‌دا زمـانێکی سـێحراوییان هەیە. جاری وایە بە توانابییەك کە لە قسەکردن‌دا هەیانە دەتـوانن سـەگی هار بترسێنن و گوڵ وشك‌بکەن. یەکێك لە نەخۆشەکانم کە پێشتر موریـدی

بیلی ویلی بوو. دەیگوت: «ئەوان لە وشەگەلێك کەڵك وەردەگرن کە وەکوو بۆمب و گووللە جەرگ بڕە. بەجۆرێك هەڵس وکەوت دەکەن کە خودا ئەوانی بۆ کارە گرینگەکان ڕاسپارد و پرس و ڕاوێژ لەگەڵ ئەوان دەکا.

هەرچەند بێ شعوورە ئاسمانییەکان دلۆڤانی بە بەشێك لە ڕێبازی ئاینییان لەقەڵەم دەدەن، بەڵام ڕەفتاریان بەجۆرێکە کە هەڕەشەیەکی جیددی بۆ بەرەی داهاتوو بەهەژمار دێن. لەڕاستیدا بە ئاشکراکردنی هەڵە و تاوانی خەڵك خۆشحاڵ دەبن. بەختەوەرانە لە خودا نزیك نابنەوە. ئەگینا ڕەخنەیان لە خوداش دەگرت.

قەشەیەك بە ناوی نیزێل ڕابێرتسۆن لە نامیلکەیەکدا «پارە لە نواندنی خوداناسایی دا ئەنووسێ: «دەبێ خاچ پەرەستێکی ڕاستەقینە لە هەموو شوێنێك بەربەرەکانێ لەگەڵ شەیتان بکا: لە هەر سێبەرێك، ژێر بەرد و لە هەر دڵێکدا». ئەگەر بە ئیمانی ڕاستەقینە لەگەڵ شەیتان سەر و کاری بێ، قەت ئاگای لەوە نابێ کە نیزیل گیرفانی بەتاڵ دەکا.

ئەگەر مرۆڤی ئیماندار بەردەوام بیر لە شەیتان بکاتەوە ئەوا نازانێ کە شەیتان فریوی دەدا و گیرفانی بەتاڵ دەکا.

*هۆگری تاوان و گوناحن. خۆیان وانیشان دەدەن کە لە تاوان و گوناح بێزارن، بەڵام بۆ فریودانی خەڵك وادەڵێن. ئەوان خاڵی لاوازی خەڵك ئاشکرا دەکەن و چێژی لێ وەردەگرن. بێ شعوورە ئاسمانییەکان، کافرن و لیباسی ئیماندارەکانیان لەبەرکردووە و پڕاوپڕن لە ترسنۆکی،

خراپەخوازی، بێزاری و ڕەشبینی. بۆ حاڵیبوون لەم نەخۆشییە واتە سادیسم گوێ بدەنە قسەکانی جیمی براگێرت کە لە ڕێ و ڕەسمی کۆتایی سیمیناری فێرکاری‌دا (هەموو تاوانبارەکان) لە کەلیسای برایانی پاك گوتوویەتی:

«دەزانم ئەگەر ڕۆژگار ئاوا تێپەڕێ و خەڵك لە تاوانەکانیان ئاگادار نەکەمەوە و دواتر پێشوازی لە درکاندنیان نەکەم، ئەوا هیچ کارێکم بۆ خودا ئەنجام نەداوە. پێم خۆشە لە حاڵەتی گریان و پاڕانەوەدا بیانبینم کە بۆ بەخشینی تاوانەکانیان داوای لێ بووردن دەکەن، لەحاڵەتێك کە فرمێسکی پەشیمانی دەڕێژن و هەست بە زەبوونی و لاوازی دەکەن. دەمهەوێ تەواوی شتە خراپەکان وەلانێن و لەسەر ڕاوە دروستیان بکەمەوە».

بەداخەوە ئەگەر بێ‌شعووره ئاسمانییەکان تەواوی شتە خراپەکان وەلانێن، هیچیان بۆنامێنێتەوە. تەنیا ئەوەیان لەدەست دێ کە گوناح بکەن ـ تۆبە بکەن، تۆبە ـ گوناح بکەن. ئەوان لە ئەنجامدانی گوناح و تاوان لێزان و کارامەن و لەوانەیە بۆخۆیان بەدیهێنەری تاوانەکان بن.

چالاکییەکان

١ ـ لە چ بوارێکەوە کافر بوون دەتوانێ هەنگاوێك لە بنەماخوازی بە خودا نزیکتر بێ.

٢ ـ داخوا تا ئێستا بێ شعوورێکی ئاسمانی هاتۆتە ماڵی ئێوە؟ چ هەستێکیان هەبووە؟ وەك ئەوەی هەمیسان لەدایك ببنەوە؟ یان دنیایەك تاوان؟

٣ ـ پێتان وایە خودا ئێوەی قەبووڵە؟

## بابەتی دەیەم:
# بێ شعووریی عیرفان خواز

«چاکرایت را باز کن و این را بگزار توش»

شێرلی ئم . وزە و توانایی بە مرۆڤێکی پێ داگر دەدەم.

ئەگەر بێ شعوورە ئاسمانییەکان نەتوانن شتی باش لە خەڵکدا ببینن، لە بەرانبەردا هێندێك هەن کە ناتوانن شتیخراپ لە مرۆڤەکاندا ببینن (یان لانیکەم ئەمە داخوازی ئەوانە). ئەوانە مندااڵانی عیرفانخوازن، ئەومرۆڤانەی کە پێیان وایە هەمووشتێکی ئەم جیهانە لەوپەڕی باشی و بێکەمایەسیدایە و هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە.

لە سەرەتادا پێت وایە ئەم مرۆڤانە بێ شعوور نین و تەنیا گێلۆکەیەکن کە هەرکەس گەوجە گەوج بکاو قسەی هەڵیتو پڵیت بڵێ باوەڕی پێدەکەن، ڕەگەڵ رۆڵز ڕۆیس بێ یان بێ ئەو. ئەوان باوەڕیان بە بەختو چارەنووسی هیند و چینییە و لەوانەیە کەمێکیش وەرزیشی جەنگی فێر بووبێن. لەوانەیە گۆشت بخۆن یان ڕەنگە نەخۆن. بەڵام زۆرینەیان ئاوی گێزەر دەخۆن و جاری وایە قاوە (هەڵبەت بە بێ شەکر). زۆربەیان خەڵکی لۆسانجلێسن.

عیرفانخوازەکان دەیانهەوێ شارێکی خەیاڵی پێك بهێنن کە هەمووشتێکی لەوپەڕی دروستی و ئارمانی دا بێ و هەرشتێك بەحاڵ کەم و کووڕی بێ وەلای دەنێن. لە دەیەی ١٩٦٠دا ئەم شێوە بیر کردنەوەیە

بوو بە داب و نەریت . هەبوونی ئەو گرووپانەی بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە و بە تەنیا ژیان بەسەر دەبەن، بۆ ناسینی عیرفان خواز بەکەڵك و پێویستە.

لەڕاستیدا هیچ شتێك لە عیرفانی نوێدا، نوێ نییە. بەڵكوو هەڵیت ـ پلێتێکە لە بیر و باوەڕی ئایینە کەوناراکان کە تەنیا بۆ خوێندنەوەی مێژووی کەونارا دەبێ.

لێرەدا یادێك لە دوو عیرفان خوازی نوێ دەکەین: یەکیان تیمۆتی بلێری و کۆلیکسیۆنێرێك لە شتی گرانبایی بە ناوی باگمەن ڕاجنیش. ئەوان ئەو گەورە بێ شعوورانەن کە زۆرینەی بێ شعووره چکۆلەکان، لەوان فێربوون کە چۆن عیرفان خوازە نوێیەکان دادۆشن و فریویان بدەن.

ئەوەیە بێ شعووری عیرفانیخواز: بازرگانێکی گەریدەن کە نە پێی ئیلهام دەکرێ و نە عەقلێکی دروست و حیسابی هەیە. بەڵام گورج و گۆڵە و دەسبەجێ خاڵی لاوازی مرۆڤەکان پەیدا دەکا. جارێك بە کلاسی لیزانی لە ئازایەتی داو دواتر لەگەڵ سیمیناری لەباو کەوتن (تەناسوخ) و دواتر لە کۆنگرەی شادکردنی خۆتدا. بەڵام ئەوانە کەڵك وەرگرتن لە ساویلکەی سروشتی مرۆڤە کە بنەمای ئارەزووی گشتی ئێمە بۆ باشتربوونە.

ئەم مرۆڤانە بەردەوام ئەوقسانە دووپات دەکەنەوە کە خودا لە هەموو جێگایەکە و کەوایە ئەوشتانەی ئەنجامی دەدەین، دەبێ لەگەڵ ئەم هێزە ئاسمانییە یەك بگرێتەوە هەتا بتوانین لەگەڵ هەرکەس کە پێمان خۆش بێ هەماهەنگ بین. ئەگەر پارەمان دەوێ بە کەڵكوەرگرتن لەو هەماهەنگییە

دەتوانین بەدەستی بهێنین. سەبارەت بە ئەوینیش بەم شێوەیە بە ئارەزووی خۆمان دەگەین.
هەڵبەت ئەم بیرۆکەیە بۆ زۆربەی خەڵك شیرین و سەرنج ڕاکێشە، بەڵام مەترسیداره. چونکە هەلێکە بۆ دەسبڕەکان کە مرۆڤە ساویلکەکان فریو بدەن و تاڵانیان بکەن.
تەنیا جارێك پێم‌وابوو لە ناو عیرفانە نوێیەکاندا کارێکی گرینگ ڕوودەدا و ئەویش ئەوەبوو کە لە سیمینارێکدا تێکڕای بەشداربووان ئەم ڕستەیان دووپات کردەوە: «تۆ بێ شعووری». زۆر باش بوو! گوتم چ باشە ئاخری کەسێك پەیدا بوو کە یاریدەدەری خەڵك بێ. بەڵام دواتر ئاشکرابوو کە ڕاهێنەرەکە لە هەمووان بێ شعوورترە. چونکە دووپات کردنەوەی ئەم ڕستەیە بۆ پروپاگەندە و بەرز نرخاندنی بێ شعوورییە نەك چارەسەرکردنی نەخۆشی!
یەکێك لە کتێبە باشەکان کە سەبارەت بە بێ‌شعووریی و عیرفانە نوێیەکان نووسراوە، کتێبی زێن و هونەری بێ‌شعووری بەرهەمی سیدنی کوان ، لەم پەڕتووکەدا بەشێوەیەکی هونەرمەندانە بەڵگە دەهێنێتەوە کە زێن شێوازێکی زانستی سەردەمی بوودابیەکانی کەونارایە کە لە سەردەمی خۆیدا قازانجی هەبووە، بەڵام ئێستا هیچ قازانجێکی نییە.
عیرفانخوازەکان لایەنگری ئارامش و هێمنایەتین. ئەگەر کەسێك دڵەڕاوکێی بێ، ئارامی دەکەنەوە و پێی ڕادەگەێنن کە خۆیان نەخەنە تەنگانەوە و بۆ ئاشتی و هێمنایەتی حەول بدا.

هێندێك لەو مرۆڤانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان سەرقاڵی سازکردنی کەمپێکی تەیار لە ئۆرێگان، مۆنتانا و شوێنە دوورەکانن و ئەوەندەیان چەك و تەقەمەنی پاشەکەوت کردووە کە توانای ئارامکردن و سەرکوت کردنی شۆڕشێکی نیکاراگوایان هەیە .

لەڕاستیدا بێ شعووریی عیرفان خواز دەتوانێ بە ئەندازەی بێ شعووریی ئاسمانی مەترسیدارو لە خۆ ڕازی بێ. لە نموونەیەکی دڵتەزێن دا، سەرەڕای بێ شعووربوونی سەرۆکی گرووپەکە، خەڵك پشتیوانییان لێ دەکرد. لە نموونەیەکی دیکەدا، سەرۆکی گرووپەکە ئامانجی خۆیان لە ڕزگارکردنی جیهان ڕادەگەێنێ و بە هەڕەشەکردن و ترساندن و تەنانەت لێدان ناهێڵێ کەس لە گرووپەکە بچێتە دەرێ.

ئەم بێ شعوورانە وەکوو بێ شعوورەکانی دیکە، لاسارو ملهوڕن. بۆ وێنە گژو گیاخۆرەکان بە هەرشێوەیەك بێ دەیانهەوێ خەڵك حاڵیبکەن کە تەندرووستی و درێژەی ژیان پەیوەندی بە خواردنی گژو گیاو ویتامینەکانەوە هەیە. بەڵام ئەگەر چاویان لێ بکەی زۆربەیان لەڕو لاواز و مردۆخەن کە لەباتی ئە و قسانە پێو یستیان بە خواردنی ئێستەیکە .

هێندێك لەوانە پێیان وایە کە تێڕوانینی داهێنەر چارەسەریی تەواوی کێشەکانە. ئەگەر بەڕاستی بتهەوێ و بیهێنییە بەرچاو. من بۆخۆم تاقیم کردۆتەوە. ماوەیەك لەوەپێش ویستم و هێنامە بەرچاو کە تەواوی بێ شعوورەکانی جیهان لە ماوەیەکی کورتدا بێسەرو شوێن بن. تا ئێستا هیچ ڕووداوێك ڕووی نەداوە. هونەری بێ شعوورە عیرفان خوازەکان دزینی

پەرتووك و داهێنەكانی خەڵكە. بێ شعووره عیرفان خوازەكان لە هەموو بابەتێكدا خۆیان بە خاوەن بیرورا دەزانن. بێتوو بیرۆكەیەك بە زەینیان بگا دەسبەجێ لەگەڵ بیرو باوەڕی خەڵك ڕێكو پێكی دەكەن و كلاسی فێركاری بۆ دادەنێن.

هەڵبەت ترۆپكی هەیەجانی عیرفانە نوێیەكان، داڕشتنی بەرنامەیەك بۆ بیروباوەڕی خۆیانە. هێندێك لەو بێ شعوورانە شریتێكی مووسیقی یان تەنیا كۆمەڵێك دەنگ و هەرا تۆمار دەكەن و چەند پەیامی كورتیان تێدا گونجاوە كە گوێی ئاسایی نایبیستێ، بەڵام بە هێزی خۆزانی و بیرورا دەركی دەكەی و بە بیستنی ئەم كاسێتانە دەتوانی بەسەر دڕدۆنگییەكان، سامو ترسەكان، تەركی جگەرە و سێكس دا زاڵ بی و تەندرووستیت بەدەست بهێنی.

من بە وردی گوێم بە یەكێك لەو كاسێتانەدا و تاوتوێم كرد. بەڵام ئەو شتانەی ئەوان پڕوپاگەندەیان بۆ دەكرد و دەیانگوت، تێیدا نەبوو. لە ئاكامدا ئەم پەیامەم دۆزییەوە: «هۆی بێ شعوور، دە دانەی دیكە لەو كاسێتانە بكڕە».

چالاكییەكان

١ ـ داخوا تا ئێستا پێتان ئیلهام كراوە؟ دەتوانن لەگەڵ كەسێك پەیوەندی بگرن كە لە سروشتدا دەست ناكەوێ؟ چ دەكێشن و مەسرەفی ڕۆژانەتان چەندەیە؟

٢ـ داخوا حەولتان داوە بە هێزی زەینی لە بەخت و یاری دا براوە بن و هەموو جارێکیش شکستتان خواردووە؟ واباشە پەیوەندی لەگەڵ ئەوکەسانەوە بگرن کە لە بارودۆخی ئێوەدان و کار دەکەن و تکایان لێ بکەن کە حەوتوویەك دەست ڕاگرن.

## بابەتی یازدەهەم:

## بێ شعووریی بوروکراسی

«مادام لەوحە قورینەکە، نەنووسراوە، کاری ئێوەش کۆتایی نەهاتووە».
دیوانی کوروشی پێنجەم بۆ شوێن کەوتووەکانی.

ناخۆشترین و ناهومێدترین شت بۆ مرۆڤی بێ شعوور، لەدەستدانی دەسەڵاتە. وەکوو ئەوەوایە کە بتخەسێنن. هەرچەند ڕەوا نییە هیچ بێ شعوورێك ئەم ئازارە بچێژێ. ڕەوشی ئامریکا بۆ ئەم جۆرە بێ شعوورانە ئەوەیە کە لە ئیدارەیەکی دەوڵەتی دا کار بکەن. بەم جۆرە بە ئاسانی دەتوانن ئەم مرۆڤە ساویلکە و گەشبینانە کە ئێستاش پێیان وایە ئەم دەوڵەتە «دەوڵەتێکی خەڵکی. بۆ خەڵك و بەدەستی خەڵکە» بترسێنن و بە سەریان دا زاڵ بن. بۆ بەدبەختی ئێمە لەگەڵ دەوڵەتێك سەروکارمان هەیە کە لە کۆمەڵێك بێ شعووری ئیداری دروست بووە و بۆ ئاسایشی ئەوان حەول دەدەین.

جوولیا کیدز لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بە ناوی خۆشی چەپەڵی سەبارەت بە پیشەی خۆی کە لە بەشی دەرکردنی بڕوانامەی ئاژۆتن دا کار دەکا دەنووسێ: «کایە و خۆشی ئێمە ئەوەبوو کە بێنەو بەرەو هاتوچۆ بە خەڵك بکەین لەحاڵێکدا هیچ کێشەیەکیان نەبوو. جاری وابوو چوار - پێنج کەڕەت دەمانگەڕاندنەوە و بڕوانامەکانمان پێ دەدان. بڕوانامەیەك کە لە هەوەڵەوە ئامادە بوون. لە تاقی کاریی نووسین دا وەڵامە دروستەکانمان

بە نادروست نیشان دەدا و بۆ تاقی کاری ئاژۆتن لە خۆمانەوە یاسا و ڕێسایەکمان دادەنا. بۆ وێنە گوێتان لەو یاسایە بووە کە ئەگەر چرا سووریش بێ گەڕانەوە بۆ لای ڕاست ئازادە؟ ئەوە یەکێك لەو قانوونانە بوو کە خۆمان هەڵماندەبەست، ئاخری وای لێهات کە ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژ لە هەژماری ئەوکەسانەی ئەو قانوونەیان قەبووڵ بوو زۆرتر دەبوو بەجۆرێك کە بەرپێوەبەرانی ئەیالەتی ناچار بوون لە قانوندا بیگونجێنن. من دەڵێم ئەوەیە دەسەڵاتی ڕاستەقینە!»

ئەوکەسانەی لە ئیدارەکان کار دەکەن، هەموویان بێ شعوور نین. هەرچەند لە مەترسی تووشبوون دان. زۆربەیان پێویستیان بە دەورەیەکی فێرکارییە تا بۆ دانیشتنی پشت مێز و بوروکراسی کردن ئامادە بن. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە ئیدارەی پۆست، مسۆگەرکردنی کۆمەڵایەتی و سەندووقی خانە نشینی بکەین. شوێنێك کە دەڵێن هەژماری شکایەت دژی کارمەندەکان، چۆنیەتی وەرگرتنی پلە و پایە و زۆربوونی مووچەی ئەو دیاری دەکا. بەم جۆرە هەر ئەندازە شکایەت دژی کارمەندێك زیاتر بێ شانسی پێشکەوتنی زیاتر دەبێ.

وازوازیمەزاجەکانیش خەڵات دەکرێن. هەرئەندازە یاسا و ڕێساکان سازگارتر بێ. بۆ بێ شعوورەکان ناخۆشتر و وەڕەز کارترە کەوایە کارکردن لە پشت مێزەکان، گرینگی پەیدا دەکا. ئێرنێستاین کابالێشێنسکی لە ئیدارەی هاتوچۆی ساندیاگۆوە دەڵێ: «ئەگەر کەسێکم خۆش بووێ زوو کارەکانی بۆ جێبەجێ دەکەم. بەڵام ئەگەر خۆشیم لە قیافەی نەهات ئەوا

کتێبی یاسا و ڕێسای شۆفیری لەپێش دادەنێم و دەڵێم بیخوێنەوە تا بزانی شۆفیری یاسای هەیە. پەل ببزێوێ تاوانباری دەکەم.

ئادۆلف ئیشنایدێر لە کتێبی «ئەو بێ شعوورانەی مـن ناسیومن». بێ شـعوورەکانی بـوروکراس دەخاتـە ڕیـزی بـێ شـعووره لەبنـەوە بڕەکانی ڕووگرژەوە کە لە بۆسەی دەسەڵات و دەرفەتدان بەڵکوو ببنە بێ شعووریی پەیتا ـ پەیتا. ئەم مرۆڤانـە توانـایی و غیرەتـی ئەوەیان نییـە کـە ببنـە بێ‌شعووری بازرگان یان سیاسەتمەدار. بەڵام پشتیوانی و هێمنایـەتێك کـە کارمەندەکانی دەوڵەتی هەیانە، هێز و دەسەڵاتیان پێ دەبەخشێ بەجۆرێك کە لەخۆڕازی دەبـن و لـە بیریـان دەچـێتەوە کـێن. لـە ئـاوا بارودۆخێکدا مرۆڤـە هـیچ‌و پـووچ و لاوازەکـانیش خۆیـان لـێ‌دەگـۆڕێ و دەسـەڵات بەدەستەوە دەگرن و ئەوەندە بەهێز دەبن کە لە خۆیـان سـووك‌و چرووكتر خایـەماڵییان لەبەردەکـەن و حـەق بـە ناحـەق لـە قەڵـەم دەدەن. هێنـدێك لەوانە ئەوەندە بەهێز دەبن کە دەچنە ڕیزی بێ شعووره شەش دانگەکانەوە و بە پلەی بەڕێوەبەرایەتی و جێگری دەگەن.

کـات‌و سـات، بـەنرخترین چـەکی بـێ شـعوورەکانی پشـت‌مێـزە. ئـەوان هەژمارێکی بەرچاو لەو چەکەیان لە بەر دەست دایە و ئێوە هـیچ. ئەگـەر داخوازی شتێك بنووسی، دەڵێن دوو حەوتوو لـەوە پـێش ماوەکـەی تـەواو بـووە. ئەگـەر داوای ئیجـازە نامـەی کاروکاسـبی بکـەی، دەڵـێن تـەنیا ساعەتی ٦ تا ٧ی بەیانی ڕۆژانی پێنج‌شەممە بۆ ئەم کـارە تـەرخان کراوە. ئەگەر پێش دەست پێکردنی پرۆژەیەك پێویستیت بە ئیجازە نامە بێ، بێ

گومان دەبێ سەبری ئەیوبت هەبێ. ئەوانە بەشێك لە قۆناغەکانی ئیداری بە هەژماردێن. بێ شعوریی ئیداری لە دەرهێنانی شێوازی نوێی بوروکراسی و وەدواخستنی کارەکان لێزان و بەئەزموونن و ئەگەر تەواوی کارەکانتان بە پێوەری قانوون بێ و نەتوانن وەڵامی نەرێنی بدەنەوە، هێند بێنەو بەرەتان پێدەکەن و دەڵێن بەم زووانە کارەکەت جێبەجێ دەبێ. کارمەند لە بەڕێوەبەرەکەی ئیجازە وەرگرێ، چونکە سەربەخۆیی لە ناوەندی ئیداری دا قەدەغەیە. بەڕێوەبەریش ئەم پەروەندەیە نیشان چەند کەسی‌تر دەدا و لەگەڵ ڕاوێژکارەکەی ڕاوێژ دەکا و دواتر نیشانی بەڕێوەبەری گشتی دەدا... بەم جۆرە پەروەندەکەتان لەناو هەزارتۆی بوروکراسی دا فەرامۆش دەکرێ.

بێ‌شعوورە بوروکراسییەکان لەوە چێژ وەردەگرن کە بێنەو بەرە بە خەڵك بکەن و خەڵك زاڵەیان بێ و ناڕازی‌بن. هەڵبەت کارێنەر ئەوە بە مافی خۆی دەزانێ، بەڵام ئەوە نازانێ کە بێ‌شعووری بوروکراس لە پاکانەو هێنانەوەی بەڵگەدا کارامەیە و لەگەڵ تۆڕێکی گەورەی ئیدارەیی لە پەیوەندی دایە و پشتیوانی لێ دەکرێ کە سەرەتای قانوون ئەوەیە کە: «ئاگات لەخۆت بێ».

کارمەندی بێ شعوور دەزانێ کە دەنگ هەڵێنان نیشانەی هێز و دەسەڵاتی ئەوە. دواتر بە دەنگێکی بەرز یاسا و ڕێساکان شرۆڤە دەکا و ئەگەر پێویست بێ لەخۆوە قانوونێك دروست دەکا. ئەگەر کارێنەر قسەو

باس بکاو لە شتەکە بکۆڵێتەوە، ئەوا بە فەرمی و قایمی ڕایدەگەێنیٚ کە سووکایەتی تۆم پیٚ قەبووڵ ناکریٚ و لە هۆدەکەی دێتە دەریٚ.

کارێنەری بیٚ چارەش نازانیٚ کە کاتی پشوودان و چایی خواردنی کارمەندەکە بووە و هۆکاری چوونەدەرێی، حەسانەوە و قسەکردنی لەگەڵ دۆستانی بووە.

کێشەی سەرەکی بیٚ شعوورە مێزنشینەکان ئەوەیە کە دەبیٚ دوای هەشت ساعەت کارکردن بگەڕێنەوە ماڵیٚ. ئەوەش دەزانن کە شازدە ساعەتی ماوە بگەڕێنەوە شوێنی کارەکەیان و ئازارو سووکایەتی کردن بە خەڵك دەست پیٚ بکەنەوە.

چالاکییەکان

١ ـ داخوا تائێستا بۆ وەرگرتنی ئیجازە نامەی دروست کردنی خانووبەرە حەولتان داوە؟ ڕەزامەندی چەند بیٚ شعوورتان وەرگرتووە؟ چەندەتان پیٚچوو؟ چەندەتان بەرتیل دا؟

٢ ـ هێندێك لە خاوەن بیرو ڕاکان پێیان وایە تەنیا ڕێگە بۆ بەرگری لە بوروکراسی، وەلانانی سەیران و گەشتی ئەوکەسانەی کە لە پشت مێزەکان دانیشتوون. بە پێشنیاری هێندێك لە ڕادیکالەکان، دەبیٚ مونشییەکان بەپێی هەژماری جێبەجیٚ کردنی کاری کارێنەرەکان هەڵسەنگێندرێن. تەواوی پەروەندەکان لە لاپەڕەیەکدا بنووسریٚ و تەواوی بنکە دەوڵەتییەکان ببنە کۆمپانی تایبەتی. ئێوە چ پێشنیارێکتان بۆ دەرکردنی بیٚ شعوورەکان لە نیزامی بوروکراسی دا هەیە؟

## بابەتی دوازدەهەم:

## بێ شعووریی داماو

«مرۆڤ دەتوانێ بنەماڵەکەی ناچار بە هەمووکارێك بکا. ئەگەر پێویست بێ دەبێ شووشەیەك ئەسیدی لوولەکردنەوە بخواتەوە».

کیتی بێ شعوورێك کە ئێستا خەریکی چارەسەرکردنە.

ڕەنگە بێشعوورە داماوەکان لە بواری دڵۆڤانییەوە لەحاند بێ شعوورەکانی دیکە کەمایەسییان پتر بێ. ئەوان وەك کرێشیسەر وان کە بەردەوام حەزیان لە تاریکی و ڕەشاییە و ئەگەر دەریان بکەی دوای چەند خولەك دەگەڕێنەوە.

لە سەرەتاوە پێت وایە بێ شعوور نین تەنیا مرۆڤێکی لاواز، بێ تاقەت و تەوەزلن و هیچ کارێکیان پێ ناکرێ. کەسانێك کە بەردەوام پێویستییان بە پاڵپشتی کەسێکە کە کارو بارەکانیان بۆ جێبەجێ بکا. هەڵبەت ئەم کارەیان وەکوو فیلمێك وایە، فیلمێك کە بە مەزەندەیی دیتنی جەریمەیەکی سێ دۆلاری خەیاڵی و ناڕاستە. ئەوەی ڕاست بێ ئەم مرۆڤانە بەهێزن، بەڵام بۆیان دەرکەوتووە بە خۆمراندن دەتوانن هێز و توانایان زیاتر بکەن.

ڕاوێژکاری بەناوبانگ لۆکریشا پۆپۆلۆپلیس لە وتارێکدا بە ناوی «بنەماڵەیەك کە بێشعوور سەرۆکایەتی دەکا». ڕادەگەیێنێ کە زۆربەی بنەماڵەکان لە بەر بێشعووربوونی گەورەی بنەماڵە تووشی لاوازی و

قەیران بوون. ئەم وتارە لە گۆڤاری یوونانی «بنەماڵەی دەرمانی»دا چاپ بووە.

«زۆرجار ئەم بێ شعوورانە لە ناو ئەندامانی بنەماڵەیان کۆمەڵێك لە هەڤاڵان. بۆ زاڵ بوون بەسەریاندا گوشاریان هێناوە. چەشنێك خەمخۆری مل هوڕانە و تۆقاندن. ئەوان دەیانهەوێ خەڵك لە پێناویاندا گیانیان بەخت بکەن. من ئەم نەخۆشییە بە دیاردەی «چاوەڕوانی مردنی دایك» ناودێر دەکەم. هەڵبەت لە کۆتاییدا دایکی بێ شعووری داماو پەنا بۆ مەرگ دەبا».

زۆرێك لە بێ شعوورەکان دەزانن کە چۆن لە هەر بارودۆخێکدا دوایین وزەیان بەکار ببەن. ئەگەر ئەو جۆرەی کە دەیانهەوێ سەرنج ڕاکێش نەبێ، خەڵك بە بێ دڵسۆزی تاوانبار دەکەن. ئەگەر بەڕادەی پێویست پشتیوانییان لێ نەکرێ، نافەرمانی دەکەن. ئەگەر گوێ بە داخوازییەکانیان نەدەی ئەوا خۆیان لە نەخۆشی دەدەن تا خەڵك بە ناچاری سەردانیان بکەن.

ژنێك دەیگوت شەش مانگ لەوە پێش دایکم سەردانی کردم و بەردەوام پرتەو بۆڵەی دەکرد، بۆ هەرشتێك هەزار بیانوو دەهێنێتەوە. بەڵام لە مەبەستی حاڵیم. دەیهەوێ بەسەر هەمووشتێکدا زاڵ بێ».

نەخۆشی سەرچاوەی دەسەڵاتداری ئەم جۆرە مرۆڤانەیە. جاری وایە ژانەو ئێش و قێزەونی بە شێوەیەکی سەیرو سەمەرە خۆی نیشان دەدا. بەجۆرێك کە پێت وایە بەڕاستی نەخۆشن و دەبێ دەرمان بکرێن.

بێشعووری داماو، جگە لە تایبەتمەندی وەك کرووزانەوە، هەڵەکاری، تۆقاندن و زاراوچوون، لە کەرەستە و شێواز گەلی تایبەت بە خۆیان کەڵك وەردەگرن کە بەرچاوترینیان «دروست کردنی شێتە».

توورەکردن، هونەرێکە بۆ شێت کردنی خەڵك. ئەم کارە بە وشیاریی و بەردەوامی لە داخوازە نامەعقوولەکان، هەوەسبازی، ناڵاندن و بیانووگرتن بەرێوە دەچێ. بێشعووری داماو گلەیی دەکا کە قەت خۆشت نەویستووە. لەبەرئەوەی ئاوڕی لێنادەیتەوە و کاتی بۆ تەرخان ناکەی، لۆمەت دەکا و دەڵێ لاچوو لە بەرچاوم. هەروەك دێزدمۆند دیکیتۆن لە کتێبی «داماو یان دوژمنی دەرەجە یەکی کۆمەڵگا» ئاماژە بەوە دەکا: «هەر ئەوەندە بۆ شێت کردنی خەڵك سەرو زیادە».

گێژوهێڕکردنی تاکەکان بە ناتەبایی و پارادۆکس یەکێکی دیکە لەو ڕێگایانەیە کە بۆ شێت کردنی خەڵك بەهەژمار دێ. ئەوان دەڵێن کەس بۆی نییە گلەیان لێ بکا و سەرەڕای ئەو وردە فەرمایشتانە، دەبێ ڕێز بۆ سەربەخۆیی ئەوان دابنێین. کەوایە چونکە بۆخۆیان دانەری ڕێساکانن، ئێمە براوەی ئەو یارییە نابین.

لەمەڕ بنەماڵە، زۆرجار دروستکاری شێت، سەر بە بنەماڵە نییە. وەکوو خەسوو یان دایکی هاوسەر کە لەگەڵ بنەماڵەی یەکێك لە کوڕەکانی ژیوار دەکا. لە دنیای بازرگانی دا دروستکاری شێتەکان سەر بەو مرۆڤانەن کە بە بێدەنگی لە نووسینگەکاندا کار دەکەن. ئەوانە ڕۆژ تا ئێوارێ بیر لەوە دەکەنەوە کە چۆن خۆیان لە کار بدزنەوە، بەوحاڵەش

ئەگەر قسەیان لەگەڵ بکەی دەڵێن ئێمە عاشق و تینووی کارین بەڵام کارەکان ئەوەندە زۆرن کە بە تەنیا بۆمان جێبەجێ نابن. ئەگەر باسی دەرکردن و سەرکۆنەکردن بێتە گۆڕێ ئەوا هەڕەشە دەکەن و دەڵێن جیاوازی دادەنێن و شکایەت لە خاوەنکارەکەیان دەکەن. دروستکاری شێت، مشەخۆرێکی کارامەیە کە بەردەوام ناڕازییە و دەڵێ خەڵك مافیان پێ شێل کردووم. لە حاڵێکدا بۆخۆی دەست ڕێژی دەکا و مافی خەڵك دەخاتە ژێر پێ.

بێ شعوورە داماوەکانیش وەکوو بێ شعوورە پشت مێزەکان. بە باشی لە کات و ساتەکان کەڵك وەردەگرن و لەو زەمینەیەدا کارامە و لێهاتوون. ئەوەندە بە شێنەیی کار دەکەن کە شەیتانۆکە لە بەرانبەریاندا وەکوو فانتۆم وایە. لە ماڵێ، هەمیشە بۆ چوونە دەرێ، دوای هەموویان خۆیان ئامادە دەکەن. ئەگەر چوونە ئاودەستخانە نایەنەدەرێ، کاری سەعاتێك بە ڕۆژێك ئەنجام دەدەن. بەجۆرێك خۆیان نیشان دەدەن کە پێت وایە هەمیشە خەریکی کارن، لەڕاستی دا هیچ ناکەن.

بێ شعووری داماو خۆی بە مرۆڤێکی فەقیرو فیداکار نیشان دەدا و لەو کارەشدا ئەوەندە کارامە و لێهاتوون کە ئەکتەری براوەی ئۆسکاریش ناتوانێ وەك ئەو ئەکتەری بکا. ئەوەندە بە ئاه و ناڵەوە قسە دەکەن کە بەزەییت پێیان دادێ. بەجۆرێك خۆیان دەمرێنن کە پێت وایە کۆیلە کراون.

هەروەك خاتوو پۆپۆلۆپلیس ئامـاژەی پـێ كـرد، ئـەم بـێ شـعوورانە بـۆ ڕاكێشانی سەرنجی خەڵك لە مـەرگیش ناترسێن و لـە بـەر ئـەوە جاروبـار كاری خۆكووژی دەكەن. هەرچەند پێشتر ئامادەكاری بۆ دەكەن كە دروست لەوكاتەدا كەسێك پەیدابێ و ڕزگاری بكا.

یەكێك لە نەخۆشەكانم كە پێشتر هاوسـەرەكەی بـە دەرمـانی دژی چـرچ و لۆچی كۆچی دوایی كردبوو دەیگوت: «ئەو خوێن مژ بوو كە هـەموو ڕۆژێ لە هەڵە و شكستەكانی من كـەڵكی وەردەگـرت. ئێسـتا خـودا ڕوحـم بـە شەیتان بكا. شوكر بۆ خودا».

چالاكییەكان

١ ـ داخوا لە بنەماڵەكەتان دا ئەو بێ شعوورانەتان هەیە كە بـە ئاكاریـان خـەڵك شێت دەكـەن؟ لـە شـوێن كارەكـەتان دا چـی؟ لـە بارودۆخـەكانی دیكەدا؟

٢ ـ تا ئێستا گوێتان لە نووكە نووكی بێ شعوورێك بووە؟ حەول بـدەن لـە سەد وشەدا شرۆڤەی بكەن.

## بابەتی سێزدەهەم:

# بێ شعووریی سکالاکار

«فیلۆس گوتی: «برۆ شکایەتم لێبکە»

مۆرچۆس گوتی: «هەروادەکەم»

بریکارەکە گوتی: «پێتی لە سەر دانێ».

فیلۆسیش داینا»

دیرۆکێکی لەمێژینەی یوونانی سەبارەت بە فەلسەفەی حقووقی یەکێك لە دەسکەوتنەکانی کۆمەڵگای دێموکراسی، مافی داخوازی لە دادوەرییە. ئەم یاسایە بۆ هەمووکەسە و دەڵێ مرۆڤێکی ئاسایی و کەسێکی دەوڵەمەند و خاوەن پلە و پایە لە بەرانبەر قانوون و دادوەریدا یەکسانن.

تەنیا یەك کێشە لە ئارادایە: ئەویش بێشعوورەکانە. شکسپێر دەنووسێ. «قانوون نەفامە». بە چاوپۆشی کردن لەم بیرۆکەیە کە دروستە یان نا، جێی داخ و کەسەرە کە سیستەمی دادوەری ئێمە لایەنگری بێشعوورەکانە و تەنانەت بەرتیلیشیان پێدەدا.

لە ئامریکا، هەر بێشعوورێك دەتوانێ بۆ ئازاردانی خەڵك ـ دژی هەرکەسێك کە پێی خۆش بێ سکاڵا نامەیەك بنووسێ و ناچاری بکات بۆ بەرگری لە خۆی پارەیەکی زۆر خەرج بکا. بەدگومانی و بیرو هزری

ناڕاست جێگەی شایەت و بەڵگەی گرتۆتەوە و دادگاکان بوونەتە گۆڕەپانی یاریی بێشعوورەکان.

یەکەم ڕێگە ئەوەیە کە نابێ بیر بکەیەوە کە سیستەمی دادوەری بێلایەنە ئەگینا شکست دەخۆی. دووەم ڕێگە، بەکرێگرتنی بریکارێکی پاك و دروستکارە (هەڵبەت ئەگەر هەبێ). چونکە تەنیا بێشعوور دەتوانێ دەرەقەتی بێشعوورێکی دیکەبێ و پەیوەندی بە دادپەروەرییەوە نییە. بۆیە بێ شعوورەکان خۆیان بە عەداڵەت و ئەوجۆرە شتانەوە ماندوو ناکەن. ئەوان تەنیا لە بیانوویەك دەگەڕێن کە دوژمن، دراوسێ، هاوکار، دۆستەکان و کارمەندەکان ئازار بدەن و هەڵبەت چ بیانوویەك لە قانوون باشتر؟

سووکایەتی و ئابڕووبردنی تاکەکان بەپێچەوانەی یاسایە. کەوایە یەك ڕێگە بۆ بێشعوور ماوەتەوە ئەویش ئەوەیە کە سکاڵانامەیەك بنووسێ و لەودا ئاماژە بە بووختان و درۆهەڵبەستن بکا. ئەوسەرییەکەی بروختانەکان ئاشکرا دەبن، بەڵام لە پەنای قانوون بە ئامانجی خۆی دەگا.

ئەوان شەڕو هەرای حقووقییان پێخۆشە. بەگشتی بەردەوام بە دوای عەیبی خەڵکەوەن و دەیانهەوێ ئابڕووی خەڵك ببەن و شەڕو هەرای حقووقی باشترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە ئامانجیانە. لەناو هێرشی مۆدێرنی ئێمە بۆ سکاڵاکردن سەبارەت بە هەرتاوانێك، بێشعوورەکان دەستیان کردووە بە سکاڵاکردن دژی:

*پزیشکەکان، لە بەر خراپ چارەسەرکردن. ئەگەر عەدالەتێك هەبوایە، دەبوایە دادگاکانیش سەبارەت بە بەڕێوەنەبردنی دەستووری پزیشکی، شکایەت بکەن.

*کۆمپانیاکان، لە بەر دەرکردن. ئەگەر یەکسانی هەبوایە، دەبوو کۆمپانیاکانیش دژی ئەو کارمەندانەی کارەکانیان بە دروستی ئەنجام نادەن. شکایەت بکەن،

*مامۆستای قوتابخانەکان، ئەگەر یەکسانی هەبووایە، دەبوو مامۆستاکانیش دژی قوتابییە تەمبەڵەکان کە کاتی کلاسەکانیان بەفیڕۆ دەدەن و مامۆستاکەیان تووڕە دەکەن، شکایەت بکەن.

*دایك و بابەکان. لەبەرئەوەی کە بۆ بەرلەدایكبوون لە باریان نەبردوون. جاریوایە ئاوڕ لە بێشعوورە سکاڵاکارەکان نادەنەوە. بۆ وێنە جارێك برێکارێك لە سەرۆك ئەنجومەنی خانووبەرەکەیان شکایەت دەکا، لەبەرئەوەی دراوسێکان دەنگی سەگەکەیان نەداوە و بەردرگای ئەوانی پیس کردووە. ڕەنگە فریشتەی یەکسانی خەوی لێکەوتبێ و ئاگای لەوەنەبێ کە بێشعوورەکان شۆڕش دەکەن.

لە بابەتەکانی دیکەدا، شکایەتی دادوەری ئەوپەڕی بێزاریی بێشعوورەکانە. ئەم بابەتە سەبارەت بە لێك جودابوونەو داوای بەخێوکردنی منداڵەکانە، ئاشکرایە بێشعوورەکان لە شەڕو هەرای بنەماڵەدا، هیچ سنوورێك دانانێن و بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانیان هەموو کارێك دەکەن. داخوا دادگا ناوبژیکاری دەکا و دەتوانێ ئەم بێعەقڵانە

کۆنترۆڵ بکا؟ بێگومان ناتوانێ، ئەوە مافی مرۆڤە چکۆلەکانە کە لە نەفامیدا بە ئەندازەی بێشعوورەکان بەشیان هەبێ و سیستەمی دادوەریش بۆ عەداڵەت و بەرانبەری پێکهاتووە.

لە کاتی کاروباری حقووقی و دادوەریدا، ئەمبابەتە لە بەرچاو بگرن کە بەگشتی بریکارەکان لە بەر کاریگەری بێشعوورەکاندان. کەوایە باوەڕتان بە بریکار نەبێ. ئەگەر بەقسەی بریکارەکەت بکەی و ئەنجامی بدەی، بەڵام شکست بخۆی، ئەوا حاشا لە هەموو شتێك دەکا و هیچ بەرپرسیایەتییەك بەئەستۆوە ناگرێ. بە پاکی و دروستی بریکار پارە نادەن. پارەیان دەدەنێ هەتا پارێزگاری لە بریگرتەکەیان بکەن.

هەڵبەت پێویست ناکا بێشعووری سکاڵابەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی بەردەوام هاتو چۆی دادگا بکا. بۆ وێنە مرۆڤی بێشعوور دەتوانێ بە شکایەتێك دراوسێکەی ناچار بکا گاراجەکەی - کە بیست ساڵ لەوەپێش دروستی کردووە - دە سانت بکشێنێتەوە یان پەنجەرەکەی ببەستێ.

لەمدواییانەدا بێشعوورە ئەکتیویستەکان تۆژینەوەیان کردووە کە قانوون دەتوانێ چەکێکی پڕ بایەخ و بەبڕشتبێ. دانیشتوانی گەڕەکێك دەتوانن سەبارەت بە دروست کردنی ئوتووبان ناڕەزایەتی خۆیان نیشان بدەن و پازدە تا بیست ساڵ کاروبارەکەی وەدرەنگی بخەن. وەدواخستنێك کە پارەکەی لە مالیاتی خەڵك دەردێ و ئەوکەسانە زەرەر دەکەن کە پێویستیان بەو ئوتووبانەیە.

بیٚشعووره سکاڵاکارەکان بە هیچشتیٚك ڕازی نابن. پیٚیانوایە نە ئاسمان بە ڕادەی پیٚویست شینە و نە ئاو تەڕە و هەمیشە ئەوشتانەی کیٚشەیان بەدواوەیە. کەسیٚك بەرپرس و تاوانبارە. تەنانەت ئیٚوەی خۆشەویست!

چالاکییەکان

١ ـ تا ئیٚستا بیٚشعووریٚك شکایەتی لیٚکردوون؟ عەدالەت بەڕیٚوەچوو؟ یان ئەو بیٚشعووره سەرکەوت؟

٢ ـ تا ئیٚستا ئەندامی لیژنەی دادپەروەری بووی؟ چەند کەس لەو لیژنەیە بیٚشعوور بوون؟ چەند کەس لە کاتی دادوەریدا خەوەنووچکە دەیبردنەوە؟

٣ ـ ئەگەر بیرکاریتان باشە. حیسابی بکەن کە بیٚشعووریٚکی سکاڵاکار تا چڕادەیەك دەتوانیٚ بیٚشعووری وەلانیٚ.

سەرنج: دەبیٚ بۆ ئەمکارە زانیاریتان لە سەر ژمارە خەیاڵییەکان هەبیٚ.

# نیشانەکانی بێ شعووری لە کۆمەڵگادا

*پڕووپاگەندەیی تەلەفزیۆنی گرووپە توندڕەوەکانی ئایینی

*تۆژینەوەی ١٩ میلیۆن دۆلاری بۆ تاوتوێ کردنی کاریگەری بای گەدەی مانگاکان لە سەر گەرم بوونی زەوی

*دانی یەك میلیۆن دۆلار بە شانۆگەرەکان بۆ بەشداری کردن لە ڕێکلامی بازرگانی دا

*ئەوەی کە کەسێك پێنسەد جووت کەوشی هەبێ

*لێهاتوویی لە ئینکارکردن دا

*کەڵك وەرگرتن کە دەنگە تۆمارکراوەکان لە فڕۆکە و ئاسانسۆرەکان: نهۆمی سێهەم... دەینگ

*تێکەڵ کردنی کۆمپانی چکۆلە لە کۆمپانی گەورە، دانی پارەیەکی زۆر بۆ کڕینەوەی بەڕێوەبەرە ڕابردۆکان.

*سووتاندنی ئاڵا بە بیانووی ئازادی گوتن

*دانی سوبسیدی زۆر بە تەمباکۆچێنەکان

*هەبوونی چەك بۆ تاقمێك لە خەڵکی سیویل *زۆربوونی بینەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

*تامەزرۆیی کۆمەڵ بە پێشکەوتن و بەرهەم هێنان و بەکاربردنی هەواڵی شادیهێنەر

*کەڵك وەرگرتن لە کورت کراوەی وشەکان

*نەزانینی مانای وشە کورت کراوەکان

*کەڵک وەرگرتن لە فەلسەفەی پڕ تەمتەراق لە کۆڵان و بازار

*بەڕێوەبەری یەك خولەکی

*سووتانی کتێب

*گەورەبوونی دەوڵەت

*ئاسایی بوونی بەگژداچوونی خەڵك

*ئەو خاوەن بڕوانامانەی نەتوانن بڕوانامەکەیان بخوێنەوە.

*هۆگری بەرنامەگەلی ئەتۆمی سەرەڕای هەبوونی خەرجی زۆر بۆ دروستکردن و هێنانی چەکی مەترسی دار

*داروی شادیهێنەر

*باوەڕی گشتی بە ڕێژەی بوونی ڕاستی

*تۆڕەکانی کریاری تەلەفزیۆنی

## بابەتی چواردەهەم:

## بازرگانی بێ شعوور

«لەباتی بەرهەم هێنانی ناپاکی نەتەوەیی، بەرەیەکی نوێ لە بێ شعوورە پاقژەکانی نەتەوەیی بەرهەم دێنن»

کتێبی بێ خەوشەکانی نەتەوەیی.

ئەم نەخۆشییە تەنیا تاقمێك گیرۆدە ناکا، بەڵکوو کۆمەڵێك لە خەڵك، لە بازرگانەوە بگرە هەتا ئەندامی یەکیەتییەکان. لە گرووپە سیاسیەکانەوە تا خوێندکاری قوتابخانە و زانکۆکان گیرۆدە دەبن و وەکوو بێ شعوورەکان ڕەفتار دەکەن. ئەگینا چۆن وڵاتێك دژی وڵاتێکی دیکە شەڕو هەڵا سازدەکا؟

کاتێك بێ شعوورێك لە پێوەرێکی گەورەدا سەرهەڵدەدا. لە پیشەی پزیشکی دا بە بێ شعووریی تاقمێك ناودێر دەکرێ و ئاماژە بە کۆمەڵێك لە خەڵك دەکا کە ڕەفتارێکی بێ شعوورانەیان هەیە. تا ئێستا، کاتێك باسی بێ شعووربوونی کۆمەڵگا دەکرێ. سەرو بنی بابەتەکە لەگەڵ هەڵەکاری کۆمەڵگا دێتە گۆڕێ. بەڵام دەزانین کە کاکڵی بابەتەکە، ئیپیدیمی بوونی بێ شعوورییە.

قسەکانی مەك‌کارتی لە دەیەی ۱۹۵۰ی زاینیی بەشێك لە خەڵکی ئامریکای گیرۆدە کرد. ڕەگەڵ بزاڤی ناڕەزایەتی خوێندکاران لە دەیەی ۱۹۶۰ بەشێکی دیکە گیرۆدە بوون. بەگشتی لە دەیەی ۱۹۷۰دا

کۆمەڵگا لەو نەخۆشییە ـ کە دواتر جیمی کارتر بە «داهێزراوی ڕەوانی» ناودێری کردبوو ـ ئازاریان دەچێشت، بەڵام چونکە کەس پێی خۆش نییە باسی بێ شعوورییەکەی بکەن. کارتێر تووشی نەخۆشی بوو بەجۆرێك کە هیچی بەدەست نەما. دەیەی ١٩٨٠ دەیەی دەرچوونی یەکسانی بوو کە سیاسەتمەدارەکان، لابیستەکان و بێ شعوورەکان ئەوەیان کردە بیانوویەك بۆ هێرشەکانیان. بەرژەوەندی داهاتووش ئاشکرایە: بێ شعووریی زیاتر، هێرشی زیاتر.

یەکێك لە بنکەکانی کۆمەڵایەتی کە تایبەتمەندی بێ شعوورییان تێدا دەبینرێ. بنکەی بازرگانییە. گرینگ ترین هۆکاری گیرۆدەبوونی بازرگانی پەیوەندی لەگەڵ پیشەسازی نیزامییە. کەین و بەینیان لە مابەین دایە. دەڵێی دەستیان خستۆتە گیرفانی یەکترەوە.

تەنیا شتێك کە ناهێڵێ بازرگانی بە تەواوی بێ شعوور بێ. بازاڕی ئازادە کە بازرگانی دەکاتە بەدیهێنەر. هەڵبەت زاتی بەرهەم لەگەڵ بێ شعوور ناکۆکە. بەڵام بازرگانی لە خۆیدا چەند نیشانەی هەیە کە ئەگەر بەدیهێنەر و ڕقەبەر قایەتیشی هەبێ، هەم لە بواری تاکی و هەم لە بواری کۆمەڵایەتییەوە، خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ بێ شعووردا هەیە. بۆ وێنە:

## چاوچنۆكی

ڕەقەبەڕەقایەتی

خوازیاری پلە و پایە و بەناوبانگی

نەناسینی ئەركی كۆمەڵایەتی

بۆ وێنە حەزو خواستی دەسەڵاتدار لە بەرچاو بگرن. ئەم تایبەتمەندییە وای لە بەڕێوەبەرانی كۆمپانیا گەورەكان كردووە كە بە كڕینی كۆمپانیا چكۆلەكان خۆیان قەرزدار كردووە بەڵام كۆمپانیای لە خۆیان گەورەتر دەیانكڕنەوە. كارێك كە لە سەر چاك بوونەوەی بارودۆخی ئابووری ئامریكا كاریگەری نییە. بیركردنەوە لە سەروەری و سەرتری شتێكی باشە. بەڵام لە بازرگانیدا كە ئامانجی سەرەكی بەدەستهێنانی سوودی ڕەواو قانوونییە فەرامۆش كراوە. كاتێك دەندووكی كاڵ كردنەوە، جمو جۆڵی پڕوپاگەندەیی. بەدەست هێنانی سەرپشكی زیاتر، پلان بۆ دانەوەی قەرزەكان، زۆر و قومار لە سەر سەودا و مامەڵەكان لە ئامانجی سەرەكی بازرگانی گرینگ تر بێ، ئەوا بازرگانی بێ شعوور بووە. كاتێك بەڕێوەبەرانی كۆمپانی قازانجیان نییە و زەرەر بە كۆمپانی دەگەیەنن و سەرەڕای ئەوەش پاداشی نیو میلیۆن دۆلاری وەردەگرن، بازرگانی بێ شعوور بووە.

هەڵبەت بێ شعووریی لە دنیای بازرگانی دا شتێکی تازە نییە، بەڵام بازرگانی مۆدێرن بە دوو شێوە ئەم بابەتە بەیان دەکا: پەیوەندی ئەندامان و پەیوەندی گشتی.

بێ گومان پەیوەندی تێکڕایی کارگێڕان لەلایەن بەڕێوەبەرەوە دروست بووە و دەیهەوێ وەك بێ شعوورێك ڕەفتاریان لەگەڵ بکا. ئەوان دەیانهەوێ کارمەندەکان ڕازی بکەن کە خەمتان نەبێ ئێمە ئاگامان لێتانە. ئەوانەی لەم زەمینەیەدا کار دەکەن لە بوارەکانی زمان لووسی، پیلانگێڕان، فێڵبازی، درۆ و تۆقاندندا بەهێز و کارامەن.

پەیوەندی گشتی بۆ ڕێك وپێکی بێ شعوورەکانی بازرگانی و سەوداو مامەڵە لەگەڵ خەڵك پێك هاتووە. پێداگری لە سەر پەیوەندی گشتی، ڕێژەی ئەخلاقی ئەوەندە بەرز کردۆتەوە کە تەنانەت سووکی و بێ ئابڕوویی واتێرگیتیش، بە شانۆی حەنەکاوی لە قەڵەم دەدرێ. هێرمیۆن هانیکات لە ژیاننامەکەیدا بە ناوی درۆ و دەلەسەکان و پێوەندی گشتی ئاماژە بەوە دەکا کە پێشتر بەقسەی کەسم نەدەکرد و درۆم بۆ نەدەکردن، هیچ سەرکەوتنێکم بەدەست نەدەهێنا. ئەو دەنووسێ: «لەدواییدا هەمووشتێك جێبەجێ بوو. حاڵیم دەکردن کە جگەرە بۆ تەندرووستی باشە. زێدەڕۆیی لە خواردنەوەی ئەلکهول تەمەنتان درێژتر دەکا. تەنانەت ڕازیم کردن کە ئەگەر دەیانهەوێ لە چنگ مشك و گیای هەرزە ڕزگار بن ئەوا زبڵ و زاڵی ژەهراوی لە حەوشە و زەوییەکانتان بڕێژن». ئەو هەتا

دوایین کاتەکان کاریگەری خراپی جگەرەی ڕەت دەکردەوە و دەیگوت:
«تەنیا هەوای خاوێنی لۆس ئانجلێس»!
لەوانەیە ڕوانگەی پیتر تۆماس سەبارەت بە بازرگانی بێ شعوور باشترین ڕوانگە بێ. ئەو لە کتێبی خۆیدا بە ناوی «ڕەمزی سەرکەوتنی خێرا» خاڵە هاوبەشەکانی بێ شعووری گشتی لە دنیای بازرگانی دا تاوتوێ دەکا:
١ ـ پێش ئەوەی پاشقولت بدەن و لە ئیدارە دەرتبکەن. فریای خۆت بکەوە و لە سەر کاریان لاببە.
٢ ـ جێگەی خۆت بە کەس مەلێ.
٣ ـ قەت شتێك شرۆڤە مەکە. هیچ مەنووسە نەوەکوو دواتر بیدۆزنەوە (ئاگات لە خۆت بێ قسەکانت تۆمار نەکەن)
٤ ـ جگە لە تاریف و پێداهەڵگوتنی خۆت. هەموو شتێك ڕەد بکەوە.
٥ ـ فێربە کە چۆن لە لێهاتوویی و تێکۆشەری ئەوانەی کارت بۆ دەکەن، سوود وەرگری.
٦ ـ هەمیشە ئاگات لە دوژمن بێ. بەتایبەت ڕاسپێراوەی دەوڵەتی، لایەنگرانی ژینگە و ڕاسپاردەی وەرگرتنی قەرزی بانکەکان.
٧ ـ خۆت ئەوەندە ناحەز مەکە. چونکە لەوانەیە ئەو بێشعوورەی ئێستا دەری دەکەی سبەینێ ببێتە بەڕێوەبەری ڕێکخراوەی ژینگەپارێزان و تووشی کێشەت بکا.

ئەگەر بەم ڕێنوێنییانە نەتوانیٚ لە کاروباری بازرگانی دا سەرکەوتن بەدەست بهێنی، ناڕاحەت مەبە. بازرگانی نەبوو، خۆ سیاسەت هەیە!

چالاکییەکان

١ ـ ئەگەر ناچاربن بۆ پێشرەوتی کار نەنکتان بفرۆشن، بە چەندەی دەفرۆشن؟

٢ ـ ئەگەر بارودۆخێک بێتە پێش کە لە پشتەوە هێرش بەرنەسەر ڕەقیبەکەتان، لە چ چەکێک کەڵک وەردەگرن؟ ئەگەر لەباتی ڕەقیب، هاوکارتان بیٚ چی؟

## بابەتی پازدەهەم:

## دەوڵەتی بێ شعوور

«دەوڵەت بوروکراسە و

بوروکراس دەوڵەتە»

جۆی بادوایزێر وتەبێژی یەکێتی کرێکارانی فیدراڵ

لە هەر وڵاتێك دا، دەوڵەت کۆمەڵێك بێ شعوور لە خۆی کۆدەکاتەوە. دەوڵەت توانایی ئەوەی هەیە کە شێوەی ژیانمان بگۆڕێ و بێ شعووریش تینووی دەسەڵاتە. بەتایبەت دەسەڵاتێك کە بتوانێ پێیان بڵێ چ بکەن و چ نەکەن. بەم جۆرە لە مەرزینگەی دەوڵەتی دادەمەزرێن.

دەوڵەت لە دوو بەشی گەورە پێكهاتووە : یەکەم سیاسەتمەدارەکان یانی خاوەن پلە و پایەکانی ئێمە کە پێیان وایە دەوڵەت ئیدارە دەکەن. دووەم بوروکراسی یانی ئەوکەسانەی کاروباری دەوڵەت جێبەجێ دەکەن.

ئەم دوو بەشە سەرنجی بێشعوورەکان ڕادەکێشن و بۆخۆیان دەبنە قوربانی بێ شعوورەکان. هەڵبەت لەوانەیە ئێمە ئەو ڕاستییە قەبووڵ نەکەین کە سیناتۆرەکان، نوێنەرانی پەرلەمان و دانەرانی قانوون بێشعوورن. بەتایبەت ئەگەر بۆخۆمان دەنگیان پێ بدەین. لە هەڵبژاردنەکاندا بە کاندیدایەك دەنگ بدەین کە مەترسی کەمتر بێ.

هەرچەند نوێنەرانی پەرلەمان دەڵێن ئێمە خەڵکمان لەپشتە و هێز و دەسەڵاتمان لەوان وەرگرتووە. بەڵام هەموو کەس دەزانێ دەسەڵاتی

ڕاستەقینەی دەوڵەت لە پێکهاتەی بوروکراسی وەرگیراوە. پێکهاتەیەك کە کارمەندەکانی خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری کۆمەڵایەتی و ژیانی ئێمەن. ئەوان هەر یاسایەك پێیان خۆش بێ پەسەندی دەکەن. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩١٣ لە ئامریکا سەبارەت بە یاسایەکی چکۆلە نووسراوەیەك پەسەند کرا کە کۆنگرە دەتوانێ مالیات دیاری بکا و کۆی بکاتەوە، بەڵام زۆر لێزانانە نووسرا بوو. لێرەدا پێکهاتەی ئیداری گەورەترین دەسکەوتی بۆ بێ شعوورەکان هەبووە: ئیدارەی مالیات یان IRS تێکەڵاوێکە لە گۆشتاپۆ، کا. گ. ب و چەند ڕێکخراوی ئاگاداری و هێمنایەتی و سامناك. لە ئاکامدا خۆبینی و لە بەرچاوگرتنی قازانجی گروپێك، واتە IRS ناڕاستەوخۆ هێندێك ئازادی - لە ئازادی قسەکردنەوە هەتا مافی شادمانی - زەوت کردووە.

مادام بارودۆخەکە ئاوابێ، بێ شعووریش دەست لە کاروباری دەوڵەت وەردەدا. هەڵبەت بەو مانایە نییە کە لە پێکهاتەی بوروکراسی دا تەنیا ئیدارەی مالیات بێ شعوور و تاوانبارە. ئەم پێکهاتەیە بەردەوام گیرۆدەی بێ شعووریی بووە تا ئەوکاتەی:

*ئیدارە دەوڵەتییەکان هەتا کاتی پێویست درێژە بە کارەکانیان بدەن.

*کۆمیسیۆنەکان وەك جاران سەبارەت بە کێشەکان توێژینەوە و بڕیار بدەن.

*لەنێوان بەهێزبوونی ڕێکخراوەیەکی دەوڵەتی و کەم بوونەوەی چۆنیەتی بنکەیەکی سەر بەو ڕێکخراوەیە، پەیوەندی ڕاستەوخۆ دروست بێ. بۆ وێنە

دوای ئەوەی کە پێکهاتەی پەروەردە و فێرکردن لە ئیدارەوە بوو بە وەزارەت خانە، چۆنیەتی و ئاستی پەروەردە و فێرکردن لە وڵاتی ئێمە دابەزیوە. هێندێك لە خاوەن بیرو ڕاکان پێیان وایە واباشە پەروەردە و فێرکردن دابڕێ تاوەکوو لە ژێر دەستی تاقمێك نەخوێندەوار دایە. بەڵام دەسەڵات بەدەست بێ شعوورەکانە!

بۆچوونی ئەم بنکە دەوڵەتیانە ئەوەندە بێکەڵك و لەکار کەوتوون و گێرەو کێشە کۆمەڵایەتییەکان پتر دەکەن؟ چونکە دەوڵەت لە زەلکاوی بێلیاقەتی، کات بەفیڕۆدان و دابو دەستووری بێکەڵك کەوتووە. سەبارەت بە دەوڵەت کار لە بێ شعووریی ترازاوە. بابەتەکە لە بێ شعووری سەرترە!

گامێرفێل لە بەسەرهاتی خۆیدا بە ناوی درکاندن و دانپێدانانی بەڕێوەبەرێکدا دەنووسێ: «لە ئیدارەی من پێ ڕاگەیشتن بە کاغەزێك درێژخایەنە و وەك ئەوەی ون بووە و بیدۆزینەوە» و یەکێك لە ڕەخنەگران دەڵێ: «بۆنی جێبەجێکردنی ئەو کاغەزە لە دۆزینەوەی کەمتر نییە».

ئەم بێ شعوورانە بە شێوازی جۆراوجۆر دەوڵەتیان ئیفلیج کردووە. لێرەدا ئاماژە بە هێندێك لەو شێوازانە دەکەین:

*شێتی کۆبوونەوە: بوروکراسەکان بەردەوام لە کۆبوونەوەکان دا بەشداری دەکەن. هەربابەتێك بێتە پێش لە لیژنەدا تاوتوێ دەکرێ. ڕاوێژکارەکان توێژینەوەی لە سەر دەکەن. کۆمیسیۆنەکان بیرو ڕایان دەردەبڕن. لە گرووپەکانی پێداچوونەوەدا قسەی لە سەر دەکرێ و کۆمیتەکانی

بەڕێوەبەر پەسەندی دەکەن. بەم جۆرە، بەرپرسایەتی بڕیاردان بە تەواوی لەناو دەچێ و کەس بەئەستۆی ناگرێ و لە داهاتووش دا ناتوانی بەرۆکی کەس بگری.

*بوروکراسی: قۆناخەکانی ئیداری بە ڕێك و پێکی بەڕێوەدەچێ بەجۆرێك کە بۆ هەرکارێك پێویستیمان بە سێ نوسخەیە. ئەم بابەتە هۆکاری بوروکراسی‌بوونە، تەنانەت ئەگەر ئەوکارە داخوازنامەیەك بێ بۆ کاغەزی زیاتر. ئەگەر ڕۆژێك بێ و بۆ دابین کردنی کاغەز گرفتمان بۆ بێتە پێش ئەوا دەولەتیش دەکەوێتە مەترسییەوە. ڕووداوێك کە زووخاو بە بێ شعوورە بوروکراسەکان هەلدێنێ و ئێمەش دەکەوینە بارودۆخێك کە مردنمان لەو ژیانە پێ خۆشترە.

*یاساو بڕیارەکان: ڕێکخراوە دەولەتییەکان بەبێ یاساو بڕیار ناتوانن هیچ کارێك ئەنجام بدەن کەوایە شوناسیان بە کۆی بڕیارەکان دەناسرێ. جگە لەوە، ئەم یاسا و ڕێسایە پارێزەری لە دەولەت دەکا و بەرگری لە پرسیاری ئەوانە دەکا کە مالیات دەدەن و دەلێن بۆچی ڕێکخراوە و ئیدارەکان پارەی خەلك سەرف دەکەن، بەلام هیچ کارێکیان بۆ ناکەن؟ کەوایە یاسا و بڕیارەکان، دەسەلات و هێزی سەرۆك و بەڕێوەبەران مسۆگەر دەکا هەتا ژێر دەستەکانیان بحەسێنەوە.

ڕەنگە ئەرتەش باشترین فاکتی ڕسکانی ئەم چەشنە بێ شعوورییە بێ. هیچ هۆکارێك و بەلگەیەك لەئارادا نییە کە ئێمە پەیرەوی لە کەسێك بکەین کە تەواوی ژیانی بۆ فێرکردن لە فێرگەی نیزانی تەرخان کردووە.

بۆیە دەبێ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمکارە لە یاسا و ڕێسا یارمەتی وەرگرین.
بۆیە ئەرتەش - لە پێوەری بەربڵاوتردا: دەوڵەت - ئەوەندە پاڵ بە یاسا و ڕێساوە دەدەن. بۆ پێ ڕاگەیشتن و ڕاگرتنی بێ شعوورەکان.

سامناك ترین بابەت سەبارەت بەم بێ شعوورانە ئەوەیە کە بوروکراسی بۆ گەورەبوون و گەشەکردن خۆی کارامە و لێهاتووە. وەك پیاوێکی قەڵەو لە شیرینی فرۆشی دا، مارشاڵ مەك دروولین لە کتێبی پیلانی بێ شعوورەکان دا دەنووسێ: «تەنیا ڕێگە بۆ بێ کەڵك کردنی هەرشتێك، زۆرکردنی ئەوشتەیە. ئەگەر ساکارو بێکەڵکە، پێچاوپێچ و دژواری بکەن. دواتر لەوە بێ کەڵك تر دەبێ و خەڵك لێحاڵی نابن و گۆڕینیشی خەرج و باجێکی زۆری دەوێ. کەوایە ورتەورت و قسەی بوروکراسەکان ئەوەیە: بی شێوێنە، بی شێوێنە، بی شێوێنە.

داخوا بۆ ڕاگرتنی و بەرگریکردن لە زۆربوونی بێ شعووری درەنگە؟ ئەگەر دەستبەکار نەبین و پلانێکی بنەڕەتی دانەڕێژین، بەڵێ درەنگە. بوروکراسی وەك هەژدیهایەکی حەوتسەر وایە کە بێتوو سەرێکی بقرتێنی دوو سەری دیکە لە شوێنەکەی دەڕوێتەوە. کەوایە تەنیا ڕێگەی ڕزگاربوون، پاککردنەوەی بێ شعوورەکان لە کۆمەڵگایە. هەوەڵ بە شێوەی تاکی و دواتر گرووپی. ئەوە ڕاستە کە پێش ئێستا لەناوبردنی بێ شعووری دەوڵەتی نەقەوماوە، بەڵام تا ساڵی ١٩٦٩ کەس نەیتوانیوە بچێتە گەرۆکی مانگ.

داخوا دەکرێ ئەم دنیایە بە بێ شعوورەکان بسپێرین یان بۆ هەمیشە کاروباری خۆمان لەگەڵ پێکهاتەی بوروکراسی یەك لا بکەینەوە؟

چالاکییەکان:

١ ـ تا ئێستا نوێنەرانی ئێوە لە کۆبوونەوەکانی دەرمانی بێ شعووریدا بەشداریان کردووە؟ بەناوی خۆیانەوە هاتوون یان بە ناوێکی دیکەوە؟ بەڕای ئێوە پێویستە لەم کۆبوونەوەدا بەشداری بکەن؟

## بابەتی شازدەهەم:

## خوێندن، نووسین و بێ شعووریی

«دەکرێ ئەم بڕوانامەیەم بۆ بخوێنییەوە»؟

داواکاری خاوەن بڕوانامەیەکی دواناوەندی لە دایکی.

جارێك توێژەرێك کە سەبارەت بە کەم بوونەوەی چۆنیەتی پێکهاتەی فێرکاری توێژینەوەی دەکرد لە قوتابیەکی دواناوەندی پرسی کە بەڕای ئێوە بۆ لە پێکهاتەی نوێی فێرکاری دا ئەنگیزە نییە. قوتابی وەڵامی داوە: «نازانم و ئەوەندە بەلامەوە گرینگ نییە!»

وەڵامی باشتر قوتابییەك دایەوە کە وازی لە خوێندن هێنابوو: «چونکە قوتابخانەکان لە ژێر دەستی بێ شعوورەکان دان!».

هەڵبەت زۆرن ئەوکەسانەی کە کەسایەتی گەورەیان هەیە و دڵسۆزانە وانە دەڵێنەوە، بەڵام بوروکراسەکان ئەرکی مامۆستاکان دیاری دەکەن و پێیان دەڵێن چ وانەیەك بڵێنەوە، ئەوەش کاروباری فێربوون و زانست تێك دەدا. لێرەدا بێ‌شعووری پەرە دەگرێ. لەباتی ئەوەی کاروباری قوتابخانەکان بەدەست خەڵکی ناوچەیی بێ کەوتۆتە دەست بەڕێوەبەرانی دەوڵەتی و لە کەوانەی بێ شعووری دا گرفتار بووە.

نیشانەکانی ئەم بێ شعوورییە بریتییە لە:

*کاتێك نیوەی قوتابییەکان لە شازدە ساڵییەوە لە فێرکاری بێ بەش دەکرێن، قوتابخانەکانمان بێ شعوور بوون.

*کاتێك خوێندەوارانی دواناوەندی ئێمە لە خوێندن و نووسینی ئاسایی دا گرفتیان هەیە، قوتابخانەکانمان بێ شعوور بوون.

*کاتێك لە بەر تەمبێ کردنی قوتابییەکی بێ ئەدەب، مامۆستا دەردەکەن و هیچ بە قوتابییەکە ناڵێن، قوتابخانەکانمان بێ شعوور بوون.

*کاتێك مافی هەموو قوتابییەك بەپێی خۆی دوعاو نزا بکا بەڵام بەرگری لێ دەکەن، قوتابخانەکانمان بێ شعوور بوون.

*کاتێك بەڕێوەبەرانی قوتابخانە ناچارن کاتێکی زۆر بۆ بەرنامەی ناسەرەکی دابنێن و ئاوڕ لە کاری سەرەکی و فێرکاری نەدەنەوە، تەواوی کۆمەڵگا بێ شعوور بووە.

بێ شعوورەکان بەرپرسی ئەم بارودۆخە نالەبارن و بۆ خۆدزینەوە لە کارەکان لێزان و کارامەن. سەندیکای مامۆستاکان دەڵێ ئێمە بێ تاوانین. دەڵێن بێدەسەڵاتین و بەڕێوەبەرانی دەوڵەتیش هەر ئەوەندە دەزانن کە ڕاپۆرتێك ئامادە بکەن کە ڕەوتی تۆمارکاری و هەڵبژاردنی بیست ساڵ بخایەنێ. بە قەولی پسپۆڕێك «ئەوانە لەباتی ئەوەی ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە. هەر ئەوەندە دەزانن بابەتەکان شی بکەنەوە. لەوانەیە وابیر بکەنەوە کە لێکدانەوە هەمان ڕێگە چارەیە».

بۆیە بەردەوام ئاگادارمان دەکەنەوە کە لاوازبوونی سیستەمی فێرکاری پەیوەندی بە هەمووشتێکەوە هەیە. لە بارانی ئەسیدیی و کەمایەسی ویتامینەوە بگرە هەتا هەژاری و نەداری گشتی و خراپەکاری. لەوە خراپتر گروپێك هانمان دەدەن کە ئەم بارودۆخە نالەبارە قەبووڵ بکەین.

دەروون ناسێك بەناوی جێروم کاپ هێد هیوادارمان دەکات و دەڵێ:
«ئەگەر دەرچوویێك ناتوانێ بخوێنێتەوە. خۆ دەتوانێ لە ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و سی دی زانیاری وەرگرێ. ئەگەر بیرکاری نازانێ، دەتوانێ لە ماشین حیساب کەڵك وەرگرێ و ئەگەر نازانێ لەکۆیە خۆ دەزانێ لە پۆلیس بپرسێ» و هەروا بێ‌کارە و بەڕەڵڵا ژیوار بکا و ئاستی چاوەنواری کۆمەڵگا (لە خۆی) بهێنێتە خوارێ. هەرچەند هێنانە خوارێی چاوەنواڕی و پێوەرە فەرمییەکان، کێشەکان چارەسەر ناکەن. ئێمە ناچارین لەگەڵ ڕاستییەکان ڕووبەڕوو بینەوە، ئەگەر تاڵیش بن. سیستەمی فێرکاری ئێمە بێ شعوور بووە.

چۆن ئەم ڕووداوە ڕووی دا کێ وەڵامدەری بارودۆخی نالەباری پەروەردە و فێرکردنە؟

هێرمان ئایشمەن که پێنج ساڵ لە سەر ئەم بابەتە توێژینەوەی کرد، پێی‌وابوو هۆکاری سەرەکی ئەم کێشەیە، جیاوازی‌دانان لە مابەین بێ ئاوەزەکانە کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لە زیادبوون‌دان. ئەو لە کتێبی خۆیدا بە ناوی «بۆ جەنایەتکار ناتوانێ بنووسێ و بۆی گرینگ نییە» دەنووسێ: «هەموو لەوە دەترسێن کە نەوەك لە شکست و ئازاری ڕۆحی قوتابییەکان دا بەشدار بن. کەوایە بەردەوام کتێبی وانە و ئەزموونەکان ئاسان دەکەنەوە».

هێندێك کاریگەری بیرۆکەی ڕەوانناسی منداڵان بە تاوانبار دەزانن. ئەو ڕەوان ناسانەی دەڵێن نابێ بۆ فێرکاری منداڵان لە سەر قسەو ویستی

خۆمان بین، چونکە ئەنگیزە، داهێنەری و هەستەکان بە باشی پەرە ناگرن. هەروەها پێیان وایە بڕوا بەخۆیی و چالاکی کۆمەڵایەتی لە بیرکردنەوە باشترە.

ورده ورده کارناسەکان بەو ئاکامە دەگەن کە ئەم بیرۆکەیە هەڵەیە. ماڵی گۆلدباد لە گۆڤاری فێرکاری تازەلاوان دا دەنووسێ: «قوتابییەکان بە هاتنە خوارێی چۆنیەتی فێرکاری و پێوەرەکان، پتر لە هەموو کەس تووشی زەرەر و زیان دەبن. بەڵێ، ئێمە ئێستا قوتابی وامانهەیە کە سەرەڕای بڕوا بەخۆیی لە گەمژەیی خۆی چێژ وەردەگرێ. بەڵێ، قوتابی وامان هەیە کە سەرەڕای داهێنەری و ئەنگیزە بۆ غایب بوون و ئەنجام نەدانی ئەرکەکانی بیانوو دەهێنێتەوە. بەڵێ، قوتابی وامان هەیە کە ئەنگێزەی زۆرە، بەڵام تەنیا بۆ هەراو هوریا و شێواندن. بەڵێ. ئێستا ئەرخەیان بووین کە هیچ قوتابییەك بەهۆی سەرکوت کردنی هەستەکانی تووشی نەخۆشی ڕەوانی نابێ، کەوایە وەکوو بێ شعوورەکان هەڵس و کەوت دەکەن».

قوتابخانەکان لە بەجێ هێنانی پێداویستی کۆمەڵگا سەرکەوتوو نەبوون، هەڵبەت کاریان کردووە. قوتابخانەکان کراوەیە و سەرقاڵی کاری خۆیانن، بەڵام لە سی ساڵی ڕابردوودا وەکوو بارمتەیەك لە خزمەت گرووپێکی تایبەت دا بووە کە ویستوویانە بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا لە سیستەمی فێرکاری ناوەندی، دەوڵەتی و هەمەلایە کەڵك وەرگرن. هەرکەس یان

گروپێك بیهەوێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی بەرەیەك لە منداڵەكان لە پەروەردە و فێركردن بێبەش بكا، بێ شعوورێكی شەش دانگە.

تەنیا ڕێگە بۆ چاك بوونەوەی سیستەمی فێركاری، دەركردنی بێ شعوورەكان لەو سیستەمەیە و دەبێ حەول بدەین ئامانجی سەرەكی پەروەردە و فێركردن ـ یانی فێركردن، خوێندن و نووسینی منداڵان ـ بێتەدی. بەڕای من یەكەم هەنگاو چاكسازی و دانانی وانەیەكی نوێ بە ناوی «بێ شعوورناسی» بۆ قۆناغی دواناوەندییە. پێداویستی ئەم وانەیە بریتییە لە:

١ ـ نووسخەیەك لەم كتێبە ٢ ـ چرا قووەیەك بۆ تاریكی ٣ ـ ئاوێنەیەك ٤ ـ ناوونیشانی لیژنەی گەڕەك و بەڕێوەبەرانی قوتابخانە ٥ ـ پێڕستێك لە كتێبە قەدەغەكراوەكانی كتێبخانە كە دەبێ بخوێندرێتەوە (لە ئەزموونی كۆتایی دا لە قوتابییەكان دەپرسن: بەڕای ئێوە بۆ ئەم كتێبانە قەدەغە كراون و چییان لێ فێر بوون)؟.

چالاكییەكان:

١ ـ دە چالاكی زەینی ناو ببەن كە هەموو ڕۆژێ ئەنجامی دەدەن. چەندەیان لە قوتابخانە فێربوون؟ چەندەیان لە دەرەوەی قوتابخانە؟

٢ ـ تا ئێستا چەند لە سەدی ئەو وانانەی لە قوتابخانە فێریان بووی، بەكەڵكت هاتوون؟

## بابەتی حەڤدەهەم:

# بێ شعووریی لە ڕەسانەدا، ئیپیدێمیکی ڕاستەقینە

«هەموو ڕۆژێ لە ڕۆژنامەکان دا سەرقاڵ کارترین ڕووداوی خەیاڵاوی دەخوێنمەوە».

ئۆلیوێر ساووت

ئێستا باسی ڕەسانەکان دەکەین یانی ڕۆژنامەکان، تۆڕەکانی تەلەفزیۆنی، گۆڤارەکان، تۆڕەکانی ڕادیۆیی و کابلی. ئەوانەم بۆ کۆتایی کتێبەکە ڕاگرتبوو، چونکە ئەگەر لە شوێنێك بێ شعووری ببێتە ئیپیدێمی، ئەوا کاری ڕەسانەیە.

لەڕاستیدا، ڕەسانە مۆدێلێکی تەواوە لە بێ شعووریی. چونکە:

*ڕەسانە لەخۆبایی و خۆهەڵکێشە: زۆر کەس پێیانخۆشە خۆیان بە «کۆڵەکەی چوارەمی دیموکراسی» ناودێر بکەن و بە ئەندازەی ئایین و دەوڵەت ڕێزو گرینگیان هەبێ. لە وڵاتی ئێمە ڕەسانەکان ڕەفتاری دژی کۆمەڵایەتی خۆیان دەخەنە ئەستۆی ئازادی چاپەمەنییەکان و بەم جۆرە پاکانەی بۆ دەکەن. بەڵام سەرنج نادەنە ئەو ئەرك و بەرپرسایەتییە کە ئەم ئازادییە پێکی هێناوە. بە قەولی سەرچاوەیەك: «نابێ ئازادی چاپەمەنییەکان لەگەڵ بێ شعووری تێکەڵ بکەین».

هەروەها ڕۆژنامە خۆهەڵکێشەکان خۆیان بە پاوانکاری ڕاستییەکان لەقەڵەم دەدەن و ڕاستییەکان هەر ئەوانەن کە بۆخۆیان گرتوویانەتە بەر.

وەکوو ئەو بیرۆکە دێرینەیە کە دەڵێ: ئەگەر دارێکی دارستان بکەوێتە عەرز و کەس نەیبیستێ و خەمی بۆ نەخوا، ئەوا هیچ شتێك ڕووی نەداوە. میدیاکانیش پێیان وایە تەنیا ئەو ڕووداوە قەوماوە کە بۆخۆیان بڵاویان کردۆتەوە.

لەبەر ئەم بیر و باوەڕە نادروستەیە کە بەشداریی خۆیان لە هێرشی پۆلیس بۆ قاچاغ چییەکان، کۆبوونەوەکانی شوڕای شار و دادگاکان بە قانوونی و ڕەوا دەزانن. ئەوان پێیان وایە تەنیا بۆخۆیان دەتوانن لە گەڵ ڕیسوایی، ئاژاوە، بەدکاری و جەنایەتەکان بەربەرەکانێ بکەن.

*ڕەسانە حەزی لە دەسەڵاتە. بەڵام چونکە دەسەڵاتی ڕاستەقینەی نییە، دەیهەوێ بە ئابڕوو بردنی ئەوکەسانەی بڕوا و ئابڕوویان هەیە، بەجۆرێك تۆڵەی خۆی بکاتەوە و دەسەڵاتی خۆی نیشان بدا. ئەم بابەتە هانیان دەدا داخ و خەفەتی خۆیان هەڵڕێژن. بەجۆرێك کە لە پشتدەرگای هەر سیاسەتمەدارێك و دەفتەری هەر ساماندارێك خۆیان مات داوە تاوەکوو ڕیسوایی ئەخلاقی و ماڵی ئەوان لەقاو بدەن. بۆ گەیشتن بە ئارەزوویان، زۆربەی کاتەکانیان بۆ شووفاریکردن لە مرۆڤە خاوەن پلە و پایەکان تەرخان دەکەن و بابەت گەلی پەراوێز و دوور لە مەبەست بەیان دەکەن. ئەگەر کار بەدەستێك ئاو و چڵم لە کەپۆی بێتە خوارێ دەسبەجێ لە سەرووی هەواڵەکان دەینووسن، بەڵام ئەگەر ئەو مرۆڤانە حەفتاوپێنج کەس لە ژێر دەستەکانیان دەربکەن کەس باسی ناکات و هەر دەڵێی هیچ نەقەوماوە.

لەوە گرینگتر ئەوەیە کە ڕەسانە حەزی لە دروست کردنی هەواڵ و شرۆڤەکاری کردنە. هەواڵنێر و بێژەرەکان بەردەوام ڕووداوەکان ڕادەگەیێنن ئەوەش ماندووی کردوون، بۆیە لە شتی نوێ و داهێنەری دەگەڕێن. کەوایە تاقمێك مفتەخۆر و بەڕەڵا پەیدا دەکەن و هانیان دەدەن شەڕو هەڵا ساز بکەن. بەم جۆرە تاڕادەیەك حەزو تاسەیان دادەمرکێنن.

*ڕەسانە سەرسەرییە. هیچ ڕووداوێك ئەوەندە دژوار نییە کە بەیان نەکرێ یان لە سێ سەد وشەدا پێك نەیێ. ڕەسانەکان ئەوەندە هەست بە بەرپرسا یەتی ناکەن کە بیسەرەکانیان ئاگادار بکەن و پێیان بڵێن ئەو شتانەی بەشێوەی ڕەش و سپی ڕادەگەیەنرێن، خۆڵەمێشین. بنەمای هەواڵ و ڕاپۆرتەکان وەکوو دیرۆکی منداڵان وایە. کەسێك یان تاقمێکی مەعسووم و خوێن شیرین کە لەلایەن گرووپێکی بەدفەڕ و شەیتان گەمارۆ دراوە و گرفتار بووە.

*ڕەسانە بەزەیی بەکەس دا نایێ. هەواڵنێرەکان ئاشقی بگرەو بەردەی ناو ڕووداوەکانن. هەر لە سەرەتای کارەکانیانەوە، بۆیان ئاسایی دەبێ کە لە بێوەژنەکان بپرسن کاتێك هاوسەرەکەت لە نهۆمی دەیەمی بینایەکەوە بەردەبێتەوە. چ هەستێکت هەیە. بەڵام کاتێك وەڵام دەداتەوە: «هەستم ئەوەیە کە شەقێکت تێهەڵدەم. بێ شعوور!». قەت باسی ئەم بەشە ناکەن و ئەوشتەی بۆخۆیان پێیان باش و سەرنج ڕاکێش بێ باسی دەکەن.

*ڕەسانەکان بیرو ڕاکانیان لە ڕاستییەکان پێ گرینگ ترە. بۆ ڕاستی و دروستی ئەم داخوازییە. دەتوانن ماوەی ساڵێك گۆڤاری تایم بخوێننەوە.

ڕەسانەکان دەیانهەوێ خۆیان بێ لایەن نیشان بدەن، بەڵام بایەخیان نەماوە و بێ شعوورن. ئەوان پێیان خۆشە وتوویژ لەگەڵ مرۆڤی ڕادیکاڵ و ئاژاوەگێڕ بکەن، بەبێ ئەوەی وتەکانی بسەلمێنێ، قسەکانی بلاو دەکەنەوە. کارێك کە چەند جار دووپات دەبێتەوە و وردە وردە خەڵك وەك بیرۆکەیەك قەبوولی دەکەن: لە هەمانکاتدا ئەگەر ڕەسانەیەك بیهەوێ کەسێك خراپ بکا، بە پرسیاری جۆراوجۆر و سەیرو سەمەرە ئازاری دەدەن و ئەگەر کەسێك سەبارەت بە ڕەفتاری نامرۆڤانە هەلوێست بگرێ، دەسبەجێ بە نەیاری ئازادیبەیان و ڕۆژنامەکانی لەقەلەم دەدەن.

*ڕەسانەکان حەول دەدەن بیرو ڕای گشتی هان بدەن. یەکێك لە فێلەکانیان ئەوەیە کە لەگەڵ کەسانێك وتوویژ دەکەن کە ئاگایان لە ڕووداوەکە نییە.

*ڕەسانەکان لەبنەڕەتەوە ڕووخێنەرن. کاریان سووك کردنی کەسایەتی ناودارە. جاریوایە هەواڵنێرێك بە تەنیا دەتوانێ کەسایەتییەك خراپ بکا و جاری واشە چەند هەواڵنێر ئەم کارە دەکەن. لە ئاوا بارودۆخێکدا تەنیا بە چەند پرسیاری تایبەت دەتوانن کەسێك بێئابڕوو، سەرشۆڕ و ڕیسوا بکەن کە دەست لەکار بکێشێتەوە. بەڵام ئەگەر دوای ماوەیەك ئەو کەسە تاوانەکان لە سەر خۆی لاببات و تۆمەتەکان بسڕێتەوە، هیچ ڕەسانەیەك ئەم هەواڵە بلاو ناکاتەوە.

هەڵبەت باس نەکردنی ئەم بەشە لەلایەن ڕەسانەکانەوە شتێکی سەیر نییە، چونکە حاشاکردن یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بێ شعوورە. جاری

وایە سەبارەت بە تۆمەتی یەک لایەنە خوازی هەڵویست دەگرن، بەلام ئەم هەڵوێستە بە بڵاوکردنەوەی کۆڕێکی ٢٥ خولەکی کە لەوەدا خاوەن بیرو ڕاکان بە جیددی قسە دەکەن تەواو دەبێ و دواتر کارناسێکی کۆنەکار بە سەرو باڵی «ئازادی ڕۆژنامەکان»دا هەڵدەڵێ. دەسبەجێ قسەکانی پەسەند دەکەن و بێ شعووری ڕەسانەش ماسماڵی دەکەن.

ئێمە هیوامان بە ڕەسانەکان نییە کە ئەم ئێپیدمییە بلاوبکاتەوە یان چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە. ئەوانە بۆخۆیان نەخۆشن! دەی بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەمکێشەیە فکرێک بۆ حاڵی خۆمان بکەینەوە و ڕەسانەکانیش ناچار بکەین هەست بە بەرپرسایەتی بکەن.

کاتێک جۆرج بووش بوو بە سەرۆک کۆماری ئەمریکا، ڕۆژنامەیەک بەشێکی حەنەکی لەژێر ناوی «پاسەوانی سەرۆک کۆمار» دانا. هەتا هەموو ڕۆژێ هەڵەکانی سەرۆک کۆمار بنووسێ. شتێک کە ئێمە پێویستیمان پێیەتی ئەوەیە کە پاسەوانێکی بێ شعوور پێک بهێنین کە هەموو ڕۆژێ بەڕێوەبردنی ئەرکەکان و کەڵکی ناڕەوا لە ڕەسانەکانی نەتەوەیی و ناوچەیی (بریتی لە تۆڕەکانی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی. ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکان) ئاشکرا بکات. هەرچەند پەیدابوونی ئاوا ڕۆژنامەیەک، لەوانەیە لە مۆجیزەی زیندووکردنەوەی مەسیحیش سەیرو سەمەرەتر بێ.

چالاكییەكان:

١ ـ نامەیەك بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەیەك بنووسن و لەودا بە پەیوەندی جنسی ناڕەوا و بەرتیل وەرگرتن یان هەركارێك كە مێشكتان دەگا تاوانباری بكەن. پێی بڵێن بۆ هەڵەو تاوانەكانتان بەڵگەمان هەیە و سەرچاوە باوەڕپێكراوەكان نایانهەوێ ناویان بێنم. لە وەڵامی سەرنووسەرەوە بۆتان دەردەكەوێ كە ئازادی ڕۆژنامەكان لە چ ئاستێك دایە.

٢ ـ سەبارەت بە ڕەسانەكان زانیاری بەدەست بێنن و لەم زەمینەیەدا چالاكیتان هەبێ. كاتێك لە ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن هەواڵێكی بێ شعوورانە دەبیستی یان دەبینی، خامۆشی بكە و كتێبێكی باش بخوێنەوە.

## بابەتی هەژدەهەم:

## کارکردن لەگەڵ بێ شعوورەکان

«ئاخ. دیسان بێ شعوورێکی دیکە»

جۆرج لە کۆڕی ئاشناکردنی بەڕێوەبەری نوێ دا

ئەگەر بێ کارو بێ پارە بن، لەوانەیە ناچارین لەگەڵ بێ شعوورەکان کار بکەن و ئێستاش هەژمارێکی کەم لە خەڵك دەزانن لەگەڵ بێ شعوورەکان کار بکەن. ئێمە لەو زەمینەیەدا ڕانەهاتووین. زۆر کەس ئەم پرسیارە دەکا کە داخۆ دەکرێ لەگەڵ بێ شعوورەکان کار بکەین و کەسایەتیمان بپارێزرێ؟ سانا نییە، بەڵام دەکرێ. سەرەتای دەسپێکردن بەخۆتانە. دەبێ ئامانج و ئەنگیزەتان هەبێ، دەبێ چەند پرسیار لە خۆتان بکەن:

*داخۆ دڵم بەکارەکەم خۆشە؟

*چەندەم پێویست بە مووچە و مانگانەیە؟

*داخۆ ئەم کارە ئەوەندەی بایەخ هەبووە؟

لەوانەیە دوای ئەم پرسیارانە وەسوەسە بن کە کارەکانتان وێڵ بکەن و وە دوای کارێکی دیکە بکەون. ڕەنگە ناچاربن لەگەڵ بێ شعوورێکی دیکە کار بکەن. ئامانجی ئەوپرسیارانە بەهێزکردنی ئیرادەی ئێوە و دەمەقرە لەگەڵ بێ شعوورەکانە.

هەنگاوی دوایی لێڕوانینی نووسراوەکانە. ئەمەش گوڵ بژێرێك لەو نووسراوانە:

*دەتوانن لەگەڵ بێ شعوورەکان کێبەرکێ بکەن. هەرچەند بۆ ئەم کارە پێشنیار ناکەین، چونکە بەو مانایەیە کە ئێوەش بێ شعوورن. سەرەڕای ئەوانە دەبنە بێ شعوورێکی تازەکار کە لەحاند بێ شعوورە بە ئەزموونەکان دا (کە لە درۆکردن، فێڵبازی، ملهوڕی، تاوانبارکردن و بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان دا لێزانن). تواناییتان کەمە. ئەگەر بتانهەوێ لە ماڵی خۆیان شکستیان بدەن، ئەوا بۆخۆتان شکست دەخۆن. کەوایە بیریی لێ مەکەنەوە.

*دەتوانن بۆ چاکسازی بێ شعوورەکان حەول بدەن. وەك دەرمانکارێك خاترجەمتان دەکەم کە چاکسازی بێ شعوورێك کە لە بێ شعووریی خۆی پەشیمان نییە، ئەستەمە. کەوایە چاکسازی بێ شعوورەکان بە دەرمانکارێکی پسپۆڕ بسپێرن.

*دەتوانن فێربن کە چۆن خۆتان لە ئازادی بێ شعوورەکان بپارێزن. ئەمکارە کەسایەتی، مرۆڤایەتی و پلە و پایەتان دەپارێزێ. بۆ ئەمکارە وریایی و وشیاری و لێهاتوویی خۆتان بنوێنن.

یەکەم شێواز ئەوەیە کە ڕواڵەتی خۆتان ڕێك و پێك بکەن و خۆتان وانیشان بدەن کە هاوکار و دلۆڤانی ئەوانن. بەڵام دەبێ ئەم ڕواڵەت سازییە بەوپەڕی لێهاتوویی بێ، چونکە بۆخۆتان لەم زەمینەیەدا کارامەن.

دووهەمین شێواز، حەول و تەقەللا بۆ پەیوەندیگرتن. ئەوان پێیان خۆشە ئاوڕیان لێبدەنەوە، گوێ بۆ قسەکانیان شل بکەی، هاودەنگیان بی،

ستایشیان بکەی، دڵگەرمیان بکەن و پیرۆزباییان پێ بڵێی. کەوایە لە گوتنی ئەم ڕستانە زێدەڕۆیی بکەن:

«سپاستان دەکەم»

«حەقتان بەدەستە»

«ئێوە کاری سەیرو سەمەرە دەکەن!.. بەڕاستی بیرۆکەی جوانتان لە مێشک دایە»!

«داوای لێ بووردن دەکەم»

هەڵبەت چاوەڕوان مەبن کە بێ شعوورەکانیش بەم شێوەیە ڕەفتارتان لەگەڵ بکەن. ئەم پەیوەندییە یەك لایەنەیە.

هەنگاوی سێهەم ئەوەیە کە جۆری پەیوەندییەکە دیاری بکەن. بەڕێوەبەرتانە یان ژێردەست یان هاوکارتان؟ دەبێ هەریەکەو بەجۆرێك ڕەفتاریان لەگەڵ بکەی.

*دڵخۆشکردنی بەڕێوەبەری بێ شعوور. بێ شعوورەکان سەبارەت بە دەسەڵات و هەڕەشەکانیان هەستیارن و قەت کارێکی وامەکەن کە دەسەڵاتی بەڕێوەبەر بکەوێتە مەترسییەوە. خۆتان بە جۆرێك نیشان بدەن کە لەگەڵ ئامانج و پلانەکانیان هاو دەنگن. هەموو ڕۆژێ سڵاویان لێ بکەن. بۆ وێنە، وێنەی بەڕێوەبەرتان لە سەر مێزەکە دابنێن یان دوعای چاوەزاری بۆ وەرگرن. لە کڕنۆش و ڕێزلێنان عافڵ مەبن کە ڕۆژێك بەهاناتانەوە دێ. حەول بدەن بە وشەی «قوربان» ناوی بهێنن. بەم جۆرە بە مرۆڤێکی ئەوتۆتان دەزانێ و پشکی تازەتان بۆ دادەنێ. بۆ وێنە

نیجازە دەدا زووتر بڕۆنەوە ماڵێ یان حەوتووی چەندجار نانتان لەگەڵ دەخوا.

*کارکردن لەگەڵ ژێر دەستی بێ شعوور. لێرەدا شێوازی کار بەپێچەوانەیە. دەبێ وەکوو منداڵێکی چکۆلە، هەستیار، کەم جێکەڵدانە و ترسەنۆک هەڵس وکەوت بکەی. هەتا بۆتان دەکرێ بە سەریاندا مەگوڕێنن. ئەم کارە تەنیا دەیانترسێنێ و بارودۆخەکە تێکدەدا. ئەوان بەردەوام پرتەو بۆڵەیانە. لێرەدا دەتوانن لە هێندێك شتو پشك بێ بەشیان بکەن. هەروەها لەوانەیە بیانهەوێ ئەرکەکانیان ئەنجام نەدەن و گوشارتان بۆ بهێنن. بەڵام ئێوە ئامۆژگارییان بکەن و بۆیان شرۆڤە بکەن کە ڕێکخراوە پێویستی پێتانە. ئەم قسانە تارادەیەك هێوریان دەکاتەوە و هەست بە سەربەرزی دەکەن.

*کار لەگەڵ هاوکارە بێ شعوورەکان: ئەم بەشە لە هەموان دژوارترە. نە دەتوانی وەکوو بەڕێوەبەری بێ‌شعوور ڕەفتاریان لەگەڵ بکەی نە وەکوو ژێر دەستێکی بێ‌شعوور. ئەگەر بە ڕێزەوە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەی ڕوودار دەبن و ئەگەر بە جیددی ڕەفتاریان لەگەڵ بکەی پێیان ناخۆشە. ئەم مرۆڤانەش دەیانهەوێ کوێخای ئێوە بن، بەڵام وەکوو منداڵێك وان کە پێویستیان بە شەقە. (لە بەرانبەر ئەم وەسوەسەیەدا بەربەرەکانێ بکەن)!.

وەکوو میوانێکی لاپلار هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ بکەن، کاتێك خەسووتان میوانە. دەبێ بەسیاسەت و لە هەمان کاتدا بە جیددی ڕەفتاری لەگەڵ بکەن. دەبێ بۆ ئەم مەبەستە هۆش و توانایی خۆت بەکار ببەی. دەبێ

سنوورەکان دیاری بکەی و ئەرکەکانیان لە مابەیندا دابەش بکەی. بۆ وێنە لە کۆبوونەوەکاندا پشتیوانی لە هاوکارە بێ شعوورەکانتان بکەن و پشکیان لێ وەرگرن. دەتوانن بلێن «من بە تەواوەتی پشتیوانی لە پرۆژەکەتان دەکەم». هەڵبەت ئەویش لەوکارەدا سەرکەوتوو نابێ چونکە پرۆژەکەی دزیوە. کاتێک هاوکارەکەت دزیت لێدەکا و بووختان بە بەرێوەبەرەکەت دەکا، چی لەگەڵ دەڵێی؟ هەر دەبێ بەسەر خۆتی نەهێنی و ئەنەهوو هیچ نەقەوماوە. پێی بڵێن ئێوە قسەخۆش و حەنەکین و ئەوەش جێی شانازییە و کەمکەس پێی دەگا. لە بەر حەنەکی و قسەخۆشی سپاسیان لێبکەن. وەبیری بهێننەوە کە ئەوە ئێوە بوون کە ئێمەتان وەپێکەنین خست. لەڕاستیدا ژیان لەگەڵ بێ شعوورەکان تاقەتی گەرەکە و بۆ زانیاری زیاتر ئەم کتێبانە بخوێننەوە کە بریتییە لە: لۆتکەوانی لە پیساوی گەڕەکدا، چۆنیەتی مەلەکردن لەگەڵ سەماسی لەناو ئاودا و چۆن کەسایەتی خۆتان بپارێزن.

چالاکییەکان:

١ ـ لەگەڵ چ بێ شعوورێك کار دەکەن؟ چۆنی لەگەڵ دەسازێن؟

٢ ـ ئامادەکاری بکەن کە کاتێك بێ شەرم و وەڕەز دەبن بە بزەوە پێشوازیان لێ بکەن. ئەگەر بۆتان جێبەجێ نابێ، لە پێش دا لەگەڵ وێنەکەی تاقی بکەنەوە.

٣ـ بەردەوام کاری ڕاهێنان بکەن خۆتان بۆ هەرچەشنە سووکایەتییەك ئامادە بکەن. بۆ وێنە ئەگەر گاڵتەی بە لیباسەکانت کرد. لەبەرخۆتەوە بڵێ «باش‌بوو وەبیرت هێنامەوە. ئەوجار دەبێ کارێکی وا بکەم کە زیاتر پیش بخۆیەوە».

٤ـ بەجۆرێك خۆتان نیشان بدەن کە بەرگەی مانگانە زیاتر خۆشحاڵتان دەکا.

٥ـ دڵخۆشی خۆتان بدەنەوە و بڵێن ئێمە لە ڕۆژدا هەشت ساعەت لەگەڵ بێ شعوورەکانین. بەڵام ئەوان ناچارن بیست‌و چوار ساعەتە لەم دۆخەدا بن. چ ئازارێك لەوە سەرتر؟

## بابەتی نۆزدەهەم:

## کاتێك دۆست بێ شعوورە

«داخۆ باوەڕتان بە تیلیپاتی هەیە؟ من هەمە»

«دۆستێکی بێ شعوورم هەبوو کە جاروبار زەنگی لێ دەدا و ئەوەی هەواڵی ناخۆش و ئازاردەر بوو ڕایدەگەیاند. دەمزانی کەی زەنگ لێ دەدا و پێش ئەوەی گووشیەکە هەڵگرم بەخۆم نەبوو لێم بەردەبوو»

ئالیس . دۆستی چەند بێ شعوور

کەس پێی خۆش نییە یەکێك لە دۆستەکانی بێ شعووربێ، بەڵام وایە. بەداخەوە لە دنیای دۆستایەتی دا دۆستی بێ عەیب و کەمایەسی نییە. ئەم دۆستانە پێش دۆستایەتی بێ شعوور بوون. هێندێك لەوانە جاروبار بێشعوور دەبن و زۆری پێ دەچێ تا بێ شعووریان ڕوون بێتەوە، یان بێ شعوورێکی لە بنەوە بڕن و هەست بە بێ شعووریان ناکەن.

کەوایە پێش ئەوەی لەگەڵیان ژیوار بکەین، دەبێ بنەمایەك و چوارچێوەیەك دیاری بکەین کە بتوانین هەڤاڵە بێ شعوورەکان بناسین. هەرکام لەو بابەتانە نیشانەیەك لە بێ شعووربوونی هەڤاڵانی ئێمەیە.

*ئەوان دەڵێن دەبێ شانازی بەوە بکەن کە دۆستایەتیتان لەگەڵ دەکەین. شانازییەك کە هەموو حەوتوویەك بۆ پاراستنی ئازار دەچێژین.

*هیچ یاسا و ڕێسایەك لە دۆستایەتیاندا نییە. جگە لەوەی قازنجی بۆخۆتان هەبێ، نابێ کەس لە داب و نەریتیان ناڕازی بێ.

*ئەوان مافی ئەوەیان هەیە بە قازانجی خۆیان داب و نەریتەکان بگۆڕن و ئێوە ئەومافەتان نییە.

*ئەوان دەتوانن لە هەرکات و بەهەر هۆیەك کە بۆخۆیان پێیان خۆش بێ پەیوەندیتان لەگەڵ بگرن، لە وەرگرتنی پارە تا ئاگاداری لە منداڵەکانیان و شاردنەوەیان لە یاسا، تا وەرگرتنی کلیلی خانووبەرەکەتان. ئەگەر دۆستێکی ڕاستەقینەی ئەوان بن نابێ بپرسن ئەوە چ داواکارییەکە و داوای شتیان لێ بکەن.

*ئەوان تەواوی گیرەو کێشەکانیان بە ئێوە دەڵێن و دەیانهەوێ هاوخەمیان بن. بەڵام ئەگەر ئێوە تووشی کێشە بن، خودانەکا ئاوڕتان لێبدەنەوە.

*دەبێ دوژمنی دوژمنەکەیان بن و ئەوەی ئەوان ناخۆشیان دەوێ ئێوەش ناخۆشتان بوێ.

*دەبێ هەمیشە پاڵپشت و پشتیوانی ئەوان بی و بە دلۆڤانییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەی. ئەگەر ئاکاری ئێوەیان بەدڵ نەبێ بە مرۆڤێکی بێ وەفا و وازوازی لەقەڵەم دەدرێن.

*نابێ ڕەخنەیان لێ بگریی و دەبێ چاو لە هەڵەکانیان بقووچێنی.

*ئەگەر سەرەڕای هەبوونی ئەم فاکتەرانە، هەمیسان سەبارەت بە بێ شعووربوونی دۆستەکانتان دوودڵ بوون، ئەوە بهێنە بەرچاوتان کە سەگ و پشیلەکەتان لە بەرچاوی ئەوان چ ڕەفتارێك ئەنجام دەدەن. ئەگەر خۆیان

لـەژێر خـرتو پرتەکانـدا شـاردەوە، ئـەوا نیشـانەی بـێ شـعووربوونی دۆستەکانتانە.

ئەگەر سەبارەت بە بێ شعووربوونی دۆستەکەت ئەرخەیان بووی، لە کاتی پێویستدا ئەم بابەتانەی خوارەوە ئەنجام بدەن:

١ ـ دۆستی وات بێ دوژمنت بۆچییە؟ ئەگەر دۆستایەتی ئـاوا بـێ، بـەبێ دۆستیش ژیوار دەکەی. جیددی بن! پێیان بڵێن هۆکاری دۆستایەتی مـن و تۆ ئەوەیە کە لەو ڕێگایەوە کەفارەتی تاوانەکانم بدەمەوە، یـان دەمـەوێ سەبارەت بە مرۆڤی تووڕە و ڕەوانی کتێبێك بنووسم.

٢ ـ ئەوەبزانن کە دۆستی ڕاستەقینە بـۆ دۆسـتایەتی یاسـا و ڕێسـادانان نییـە، بـەڵام سـنوورێکی ژیرانـە لـە بەرچـاو دەگـرێ. ئەگـەر مـانگێگ سـەیارەکەت بـە کەسـێك بـدەی کـارێکی عاقڵانـەت نـەکردووە، مـەگین کرێکەی بدا و باکی بێنزینەکەش پڕ بکاتەوە.

٣ ـ پێیـان بڵـێن ئەگـەر وەك ڕەوان پزیشـکێك هـەڵسو کـەوتم لەگـەڵ دەکەی، دەبێ پارەم پێ بدەی.

٤ ـ تێیان بگەیـەنن کـە ئـەو کەسـانە حـەقیان بەدەسـتە کـە لـە پێڕستی دۆستانی خۆشەویست و تەنانەت ئاسایی ئێوەدا نین و ئەگەر ئێستاش لەو پێڕستەدا ماون بەو مانایەیە کە پێڕستێك لە دۆستانی ناشیرین هەیە.

٥ ـ پێیان بڵێن کـە دەمـەوێ ڕادەی پرتـەوبۆڵـەی ئێـوە مەزەنـدە بکـەم و دەتـوانن نـاوی خۆتـان لـە کتـێبی گینـیسدا بنووسـن کـە دەرحـەق بـە دۆستەکەی زۆرترین پرتەو بۆڵەی کردووە.

٦ ـ فینار بکەن و هیچ نیشانەیەك لە خۆتان بەجێ مەهێڵن.

هەڵبەت ئەوەی کە تا چ ڕادەیەك وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدرێتەوە، پەیوەندی بە تایبەتمەندی بێ شعوورەکانەوە هەیە. هەروەها لەوانەیە ئەنجام دانی ئەم پێشنیارانە هەڵوێستی توند، هاتو هاوار، قسەی ناحەز و جنێو بە دایكو باب و تێ هەڵکردنی (شتی) بە دواوە دەبێ.

ئەگەر ڕووداوی لەم جۆرە قەوما، بگەڕێنەوە بۆ دواوە و خۆتان بەجۆرێك نیشان بدەن کە ئازارتان پێ گەیشتووە. دواتر پێی بڵێن هەتا داوای لێبووردن نەکەن قسەتان لەگەڵ ناکەم.

چالاکییەکان:

١ ـ داخۆ دۆستی بێ شعوورتان هەیە؟

٢ ـ بۆ؟

# بابەتی بیستەم:

## زەماوەند لەگەڵ بێ شعوور

«لەوکاتەوە کە ماچی دەکردم و جگەرەکەی هەر بە لێویەوە بوو زانیم کە ئەوین لە ژیانمان دا بزر بووە».

ماری جین (هاوسەری بێ شعوورێك)

ڕەنگە هیچ شتێك لەوە ڕاچڵەکێنەرتر نەبێ کە بەیانییەك لە خەو هەستی وهەستبکەی کە بێ شعوورێك لە پێخەفەکەتدایە! هێندێك لە یەکەم شەوی زەماوەند هەست بەو ڕاستییە تاڵە دەکەن و هێندێك دوای چەند ساڵ، ماوەی حاڵی بوون گرینگە.

ئەو ڕەوشانەی بۆ هاوکار یان دۆستی بێ شعوور بەکار دەبردرێ بۆ هاوسەری بێ شعوور نابێ. کەوایە دەبێ چ بکەین؟ زۆر نین:

*تەڵاق: ئەم کارە ئەوەندە باش نییە و پێشنیاری ناکەین، چونکە ئازار دەرترین شت بۆ بێ شعوور جیابوونەوە لە ژیانی هاوبەشییە. ئەگەر لە بێنەو بەرەی دادگا ڕزگاربن و خەرجی دادگا پشتیان نەشکێنێ، هاوسەری ڕابردووتان بەشوێنتەوەیە هەتا ئەرخەیان بێ کە پەشیمان بوویەتەوە. هەڵبەت ڕەنگە بە درێژایی تەمەنت لە پەشیمانی دابی، چونکە هەرکەسێك جارێك عاشقی بێ شعووربێ، هەتا کۆتایی تەمەنی ئاخ هەڵدەکێشێ.

*ڕاکردن بۆ وڵاتێکی بیانی بە ناوێکی دیکە: ئەم کارەیان باشە، بەڵام سەبارەت بەو بابەتانەی لە نووسراوەی تەڵاقدا ئاماژەی پێکرد. ناکرێ مەگین زۆر زیرەك بی و پێش ڕاکردن خۆت بمرێنی و ڕێگات پێ بدەن.

*خۆکوژی: لە جیابوونەوە باشترە بەڵام ڕاکردن لەوە بەکەڵك ترە. خراپی ئەم ڕەوشە ئەوەیە کە ناتوانی بگەڕێیەوە و تێدا دەچی.

*مرۆڤکووژی: دنیای پزیشکی ئیجازە بەم ڕەوشە و ڕەوشی ڕابردوو نادا، بەو حاڵەش جاری وایە چارە نییە. ئەگەر یارمەتیتان دەوێ. دۆستێکی باشم هەیە بە ناوی گیدۆ ...

*ئێرکاری و فێربوونی ژیانی هاوبەش لەگەڵ مرۆڤی بێ شعوور: ئەم بابەتە تاوتوێ دەکەم. هەرچەند ئەم کارە ناکرێ مەگین چەند بیرۆکەتان لەمێشك دا بێ:

١- قەبووڵی بکەن کە ناتوانن ژیانێکی ئەوتۆتان هەبێ، ڕەنگە دواتر. چاوەڕوانیتان لە ژیانی هاوبەش کەم بکەنەوە. بە قازانجی خۆتانە.

٢- ئەگەر هەروا خەمبار و ژاکاون. دیسان چاوەڕوانییەکان کەم بکەنەوە. ئەوەندەی کەم بکەنەوە کە زەماوەند لەگەڵ بێ شعوریش خۆشحاڵتان بکا.

٣- فێربن کە گوێنەدەنە چەنەبازی و ناوچاوگرژی ئەو و خۆتان تووڕە مەکەن و بۆ سەرکوتکردنی هەست و کەم بوونی خۆشەویستی خۆتان، خەم و خەفەت مەخۆن.

٤- بە تێبینییەوە جێگرەوەکان تاقی بکەنەوە. لەناو ئەو کەسانە دۆست هەڵبژێرە کە هاوسەری بێ شعووریان هەیە. بەم جۆرە هاوخەمێك پەیدا

دەکەی و دەتوانی دەردی دڵی لەگەڵ بکەی و کەمایەسی عاتفی قەرەبوو بکەیەوە. گیدۆ دەتوانێ (بە سرویسی باش) پێتان ڕابگا و هەموو داواکاریەکانتان بۆ جێبەجێ دەکا.

٥ ـ هەتا ئەو جێگایەی دەتوانن لەگەڵ هاوسەرتان بە مێهرەبانی هەڵس وکەوت بکەن و لەگەڵی بسازێن. ئەم کارە خۆشەویست زیاد دەکا و لە ناکۆکی و زەرەرو زیانەکان کەم دەکاتەوە. بۆ وێنە کاتێک لە کار دەگەڕێنەوە داوای لێبووردن بکەن. ئەم کارە لە دەماری دەخا و ژێردەبێتەوە و بۆخۆشتان باشە.

٦ ـ ئەگەر هاوسەرەکەتان ئەمەکدار نییە و ناسپاسە و حەزی لە کێشەو هەرایە، ئەوا لەگەڵ بێ شعوورێکی ئاسایی زەماوەندتان نەکردووە بەڵکوو بێ شعوورێکی شەشدانگە. لێرەدا یارمەتی بدەن هەتا کوڵی دڵی هەڵڕێژێ و ڕێگەیەك بۆ هێوربوونەوەی خۆی بدۆزێتەوە. دلگەرمی بکەن تا لە فێرکاری شەڕی چریکی و بەرگری کردندا بەشداری بکا. بۆخۆشتان فێری کاراتە بن.

داخۆ ڕاوێژکاری بنەماڵە بەکەڵکە؟ بێ گومان بەڵێ. هەروەك ساندێرز مامۆستای تاکتیکی شەڕو ڕاوێژکاری بنەماڵە لە وێست پۆینت دا دەڵێ: هاتنی ئەو ژنو مێردانەی کێشەی بێ شعووریان هەیە بەکەڵکە، هەڵبەت نەك وەك نەخۆشییەك، بەڵکوو وەك ئاوێنەیەکی عیبرەت! هەتا بزانن کە ژیانیان ئەوەندە خراپ نییە. ئەوان ژیانی هاوبەشی خۆیان لەگەڵ بێ

شعوورەکان هەڵدەسەنگێنن و بایەخی ژیانی خۆیان دەزانن و حەول دەدەن بیپارێزن و ڕێز بۆ یەکتری دابنێن.

زۆرینەی خەڵك. ساندێرز بە ڕەش‌بینی تاوانبار دەکەن. لە بەر پێداگری لە سەر ئەم بابەتە کە «زەماوەندی خراپ چارەسەر ناکرێ، تەنیا بەرگری لێ دەکرێ». ڕاسپاردەی ئەو لە ئاوا بارودۆخێکدا ئەوەیە: «تەنیا بڵێ نا».

چالاکییەکان

١ ـ چەند زەماوەند لەناو خزم و کەسەکانتدا سەری نەگرتووە؟ پێکەوە نەسازان یان بێ شعوور بوون؟

٢ ـ چەند جار لێك جودا بوونەوە؟ بۆ ئەوەندە زەماوەند دەکەی؟

# بابەتی بیست و یەکەم:

## بێ شعووری زگماگ

«کاتێك پشیلەکەی خنکاند زانیم کە ڕۆژگارێکی ڕەش چاوەڕوانیم دەکا».

جێن. دایکی بێ شعوورێکی چوارساڵە.

لەمێژە ڕەوانناسی منداڵان پێیان وایە بابەت گەلی وەك منداڵی گەندەڵ لەئارادا نییە، ئەوەی هەیە منداڵانێك هەن کە تووشی گەندەڵی بارودۆخی خراپی کۆمەڵایەتی و ئاکاری نالەباری بنەماڵە بوون. بۆیە دەسبەجێ دەرمانکارەکان تاوانەکەی دەخەنە ئەستۆی کۆمەڵگا و دایك و باب.

توێژینەوەکانم نیشان دەدەن کە هێندێك ڕاستی لە بەرچاو نەگیراوە. هەمووومان دەزانین کاتێك گوڵ و سەوزی بچێنین و شوێنەکەی بۆ ئامادە بکەین، تەنیا گوڵ و سەوزی شین نابێ. گژو گیای دیکەش شین دەبن. ئەم بابەتە سەبارەت بە مرۆڤیش دروستە و شیاوی فاکت هێنانەوەیە. هێندێك لە منداڵەکان سەرەڕای هەبوونی دایك و بابی بەشەرەف و بنەماڵەی باش، تووشی نەهاتی و نەهامەتی دەبن. لەڕاستیدا هێندێك لە منداڵەکان بەدفەڕ و خراپ کار لە دایك دەبن. ئەوان:

*لە ئازاری جرو جانەوەر و حەیوانی چکۆلە چێژ وەردەگرن.

*جوابی دایك و بابیان نادەنەوە.

*ڕۆژی خۆشی ئەوان ئەو ڕۆژەیە کە خراپەکاری بکەن.

بە کورتی بێ شعوور لەدایك دەبێ، مندالّی بێ شعوور دایكو بابی بێ شعوور. دوکتۆر مۆنتاگ فیشبۆر گێر مامۆستای دەروونناسی مندالّ لە زانکۆی میلپیتاس دەلّێ کە ڕوانناسەکان عادەتیان بە بیرۆکەی مندالّ ئازاری کردووە بۆیە بەردەوام دایك و باب بە تاوانبار و مندالّ بە بێ گوناح لە قەلّەم دەدەن.

دوکتۆر فیشبۆرگێر دەلّێ: «دروستنییە. من سێ مندالّم هەیە هەموویان بێ شعوورێکی شەش دانگن. من و هاوسەرەکەم شتێکیان بۆ ئامادە دەکەین، مالّێکی خۆش و لەبەردلاّن، بەردەوام ئاگامان لێیانە. خۆشمان دەوێن و چاوپۆشی لە هەلّەکانیان دەکەین و حەولمان داوە سەربەخۆ بن و هەست بە بەرپرسایەتی بکەن، بەلاّم سەرەڕای ئەوانە شەڕانی و گەندەلّ بار هاتوون».

ئەوەندە شەڕانی و بەدفەڕ کە پێکەوە پلانیان داڕشت بوو مامۆستاکانیان بە ئەنجام دانی کاری سێکسی تۆمەتبار بکەن. چەند داستانی سێکسیان پێکەوە نابوو تا لەکاتی پرسیار و دادگادا قسەکانیان یەك بێ و کەس شکیان لێ‌نەکا. دواتر ئەمچیرۆکەیان بۆ دایك و بابیان گێڕاوە و باوەڕیان کرد و شکایەتیان کرد. ئەو سێ مامۆستایە دەرکران. هەرچەند دواتر ئاشکرابوو کە ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری پۆرنەوە وەرگیراوە و تۆمەتەکەیان پاك بۆوە. بەلاّم مامۆستاکان دوو سالّ سووکایەتییان پێ‌کرا و لە گیرفانی خۆیان خەرجی دادگا و بێ کاربوونیان دا و پیشەی دوکتۆر فیشبۆرگێریش زیانی قەرەبوونەکراوی لێ کەوت.

داخوا زۆریان ڕوو پێ داون یان بێ شعوور لەدایك بوون؟ خاتوو کاساندرا تایت گات، داهێنەری بزاڤی ئاژاوە بەڵام بەکەڵك «هەر ئەوەیە» بۆ منداڵانی لاسار، لەگەڵ دوکتۆر فیشبۆرگێر هاودەنگە. ئەو دەڵێ: «لە تەمەنی سی و شەشساڵیمدا کچەکەم (کە تەمەنی شازدە سال بوو) بۆ دووەم جار منداڵی لەبار چوو و کوڕەکەشم لە تەمەنی پازدە ساڵیدا لە بەر فرۆشتنی مادەی سڕکەر ڕەوانەی زیندان کرا. بۆیە چووم منداڵانم بەست، هەرچەند دەمزانی ژێستێکی سەمبوولیکە.

کاتێك لە نەخۆشخانە کەوتبووم. بیرم لەوە دەکردەوە کە منداڵەکان بە ناڕەوا لە میهرەبانی و خۆشەویستی دایك و بابیان کەڵك وەردەگرن. لە ئاخری دا تێگەیشتین کە زۆرمان ڕوو پێ داون. لێرەدا شێوەی «هەر ئەوەیە» بە زەینم گەیشت. من ئەو وانەیەم تەدریس کرد و دایك و بابەکان زۆریان پێ خۆش بوو. بەجۆرێك کە لە ماوەیەکی کورتدا خەڵکێکی زۆر هاتنەلام و ئێستا دوازدە هەزار گرووپی «هەر ئەوەیە». لەم زەمینەیەدا کار دەکەن. ئەم ڕەوشە، ڕێگە چارەیەکە بۆ ئەو دایك و بابانەی دەیانهەوێ منداڵە بێ شعوورەکانیان کۆنترۆڵ بکەن و لە سەر ئەو بنەمایانە دانراوە:

١ ـ ئێوە تاوانبار نین. قسەی ئەوەم نییە بۆخۆتان منداڵەکانتان بە لاڕێدا ببەن. هەروەها ئەرکی ئێوە نییە کە هێمنایەتی خۆتان فیدای منداڵەکانتان بکەن. تەنیا مام ناونجی بن و لەم زەمینەیەدا پێداگری بکەن. کاتێك منداڵی شازدە ساڵەتان بۆ ڕۆژی پشوودان داوای سەییارە

دەکا، لەبیرتان بێ کە ئابراهام لینکۆڵن هەموو ڕۆژێ بەپێیان دەچوو بۆ قوتابخانە کە مەوداکەی نۆ مایل بوو، بەڵام دواتر سەییارەیەکیان بەناوی ئەو دروست کرد .کاتێک منداڵەکەتان دەڵێ: «ئەرێ، سەیارەیەك بۆ پیرە ترکەنەکان» ئێوەش وەلامی بدەنەوە «هەر ئەوەیە».

٢ـ کاتێك منداڵەکانتان ئەگرین و گرووو دەگرن، پێیان ڕابگەن و بزانن ئازار بەکوێیان گەیشتووە. ئەگەر وانەبوو، بڵێن بێ دەنگ بە. پێت خۆشبێ و پێت ناخۆش بێ «هەرئەوەیە».

٣ـ ئەگەر هەست بە بەرپرسایەتی ناکەن و کێشەتان بۆ سازدەکەن. ئەوا لە ماڵێ وەدەریان نێن. با بزانن پووتێك چەند کیلۆیە. (ئەم ڕەوشە منداڵی چکۆلە لەخۆ ناگرێ)

٤ـ کاتێك بینیتان منداڵەکان بە شەمچە و کوکتل مولوتوف کایە دەکەن وجواب نادەنەوە و گاڵتەیان پێ دەکەن و دەیانهەوێ ئاگر لە وڵات بەربدەن، پۆلیس ئاگادار بکەن. لێیان گەڕێن با چەند شەو لە زینداندا بن وقەدری ماڵێ بزانن. ئەگەر سکاڵایان لە پۆلیس و زیندان بوو بڵێن» «هەرئەوەیە دیتووتانە».

٥ـ لە شەش ساڵەوە منداڵەکان فێربکەن و داوایان لێبکەن لە کاروباری ماڵێ یارمەتیتان بدەن. ئەو بێ شعوورانەی مشەخۆری کۆمەڵگان و ڕۆژگارێك خۆشەویستی دایك و بابیان بوون. ویژدانی کارو هەستی بەرپرسایەتی درەنگ و زووی نییە. «دەمهەوێ. نامهەوێ» ئەوانەمان نییە. «هەر ئەوەیە»

٦ ـ لەڕاستیدا تەلەفزیۆن ڕۆڵێکی گرینگی لە بێ شعوورکردنی منداڵاندا هەیە. کەوایە بۆ بارهێنانی منداڵان، تەلەفزیۆنەکە فڕێ بدەن، چونکە «هەر ئەوەیە».

٧ ـ داب و دەستوورێکی بەرتەسك و توند لە ماڵێ دابمەزرێنن. ئەگەر حەوتووی جارێك خۆیان لە کار دزییەوە و وەڵامیان نەداوە، تەلەفزیۆنەکەیان لێ خامۆش بکەن. ئەگەر حەوتووی دووجار نافەرمانیان کرد. ناچاریان بکەن گوێ بدەنە یەکێك لە گۆرانییەکانی سەدەی بۆق لێدان. (سەبارەت بە ئەدەب و ئەرکناسی لاوەکان) ئەگەر پێیان ناخۆش بوو بڵێن: «هەر ئەوەیە».

٨ ـ چەند زەربە (بە هێواشی) لە سمتی منداڵەکان بدەن، نەتەنیا مەترسیدار نییە بەڵکوو بەرگری لە بێ شعووربوونی کۆمەڵگا دەکا. ئەگەر لەوە گەورەترن و بەو کارانە تەمبێ نابن ئەوا دەتوانن ڕەوشێکی دیکە بەکار ببەن. کەوایە بۆخۆتان منداڵەکانتان ئەدەب بکەن. چونکە لەوە باشترە خەڵك ئازار بدەن. ئەگەر گریا و گوتی ئازارم پێگەیشت بڵێ: «هەر ئەوەیە».

٩ ـ ئەگەر لەناو کەرەستەکانی دا چاوت بە کۆکایین، کۆڵت، کاندۆم و هەرشتێکی قەدەغەکراو کەوت. هەموویان بۆخۆت هەڵگرە و دوو ڕۆژ تەنیا ئاو و نانی بدەیێ. ئەگەر پرتەو بۆڵەی کرد بڵێ «هەر ئەوەیە».

بە ئەنجام دانی ئەم ڕەوشە، بە یەکێك لەو ئامانجانە دەگەن: یان منداڵەکانتان ئاکارو ڕەفتاریان باش دەکەن و دەبنە منداڵێکی ئاقڵ یان ئێوە بەجێ دەهێڵن. لە هەردوو حاڵەتدا ئێوە براوەن!

چالاکییەکان

١ ـ بەڕای ئێوە منداڵەکان لە چ تەمەنێکدا خۆیان دەناسن و دەتوانن ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن؟ بیست و یەك ساڵان؟ هەژدە ساڵان؟ دوازدە ساڵان؟ لەوکاتەوە کە دمەدمەتان دەست کردووە؟

٢ ـ داخۆ ئەمڕۆ منداڵەکانتان تەمبێ کردووە؟

## بابەتی بیست و دووهەم:

## ئەو منداڵانەی دایك و باوکیان بێ شعوورە

«کاتێك مامۆستای باخچەی منداڵان بۆ یەکەم جار بە ناوی «کۆین» بانگی کردم. ئەوجار زانیم کە ناوم «هۆی گوێرەکە نییە»».

کۆین. منداڵی دایك و باوکێکی بێ شعوور

لەباری مێژووییەوە، ڕەنگە بەش خوراوترین گرووپێك کە قوربانی بێ شعووریی بوون، منداڵەکان بن. جاری وایە ئەو منداڵانەی لەباری جەستەییەوە ئازاریان پێگەیشتووە یارمەتی دەدرێن، بەڵام ئاوڕ لەو منداڵانە نادەنەوە کە لەباری ڕۆحی و ڕەوانییەوە ئازاریان پێ دەگا. کەواتە پێیان وایە شێتن یان لە بەر کارە خراپەکانیان هەست بە تاوان دەکەن. لێرەدا تێ دەگەن کە منداڵی بێشعوورن. ئەوان لە کاتێکدا پێ دەخەنە دنیای گەورەکان کە هەست بە گەورەیی ناکەن، بەڵام بەختەوەرانە کتێبەکان و دەرمانکارەکان بۆ ڕزگاتربوون لە چنگ دایك و بابە بێ شعوورەکان، یارمەتییان دەدەن. ئەم گرینگایەتییە هەیە، چونکە توێژینەوەکان نیشانیان داوە کە منداڵی دایك و بابە بێ شعوورەکان بۆخۆشیان بێ شعوور دەبن، مەگین ژیانێکی نوێ فێربن.

کەسانێك کە بیست ساڵ لە باشترین ساڵانی تەمەنیان بە بێ شعووریی بردۆتەسەر، ڕێگە چارەیەکی خێراو مۆجزە لەئارادا نییە. بەڵام لانی کەم دەزانن کە سەبارەت بەو ژیانە تاڵە تاوانبار نین. یەکێك لەو کەسانەی

دایك و بابی بێ‌شعوور بوو دەیگوت: «کاتێك کە زانیم تاوانبار کێیە.

چارەسەری و دەرمانم خێراتر بووە. ئێستا لە خۆم بێزار نیم چونکە دایك و

بابم تاوانبارن».

چەند نیشانە لەو منداڵانەی دایك و بابیان بێ شعوورە:

*هەتا بۆیان دەکرێ لە دایك و بابیان دووری دەکەن. زۆرینەی خەڵکی

ئالاسکا لەو منداڵانە پێك هاتووە.

*لە جەژنی لەدایك بوونی دایك و باباندا بەشداری ناکەن.

*ماوەیەك لە تەمەنیان بە شێتی ڕادەبوێرن و وادەزانن بێ شعووریی

نەخۆشییەکی ڕاستەقینە نییە. لێرەدا لە بارودۆخێکی مەترسیداردا دەبن

و خۆیان پێ ڕاناگیرێ، بەجۆرێك کە لەگەڵ بێ شعوورێك زەماوەند دەکەن

و ئەم دۆخە دووپات دەبێتەوە. بۆیە یارمەتی و ڕێنوێنی پسپۆڕانە

پێویستە.

کێشەی ڕاستەقینەی ئەو منداڵانە کە بێزاری، ناهومێدی، ترس و

تەوەزەلی بەدواوەیە چییە؟ لێرەدا کورتەی ئاکامی چەندساڵ توێژینەوە

شرۆڤە دەکەین:

١- ئاریشەی پێوەندی گرتن لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکە: هاری کوڕی دایك و

بابێکی بێ شعوور دەڵێ: «هەتا بیست و سێ ساڵان نەمدەزانی کە مرۆڤی

بێ خووش پاکیش هەیە. وامدەزانی هەموو مرۆڤەکان لە دایك و بابم

دەچن.

٢ ـ لە پەیوەندیگرتن لەگەڵ خۆشیان کێشەیان هەبوو، چونکە لە هەوەڵەوە و لە سەردەمی پێکهاتنی کەسایەتیاندا لەگەڵ بێ شعوور بوون. بە بێ شعووریی بارهاتوون. یەکێك لەوانە بە ناو ویرجینا کە دوای سێ ساڵ دەرمان، تازە لە دنیا حاڵی بووە. دەڵێ: «مندالّ بووم پێم خۆش بوو وەکوو دایکم بێ شعووربم. ئێستە دەزانم چەندە گەمژە بووم و چەندەم زیان لێ کەوتووە. دەبێ سەربەخۆ بم و بۆخۆم ژیان بکەم. دەبێ دووبارە لەدایك ببمەوە. تکایە ناوێکم بۆ هەڵبژێرن».

٢ ـ ئاریشە لە بیرکردنەوەدا: ئەوان مافی ئەوەیان نەبوو بیر بکەنەوە تا بتوانن خاوەن بیروڕا بن. کەواتە بە شكو گومان، شلكو وازوازی و تەنانەت سەرپێچی لە یاساکان گەورە دەبن. ترسێکی هەمیشەیی لەوەیکە تووشی هەڵەیەکی نەبەخشراو بن یان لەخۆوە کارێك بکەن و بیاندەنە بەر تانەو توانج. ئالیس یەکێکی دیکە لەو دەرمان کراوانەیە کە لە چنگ دایك و بابی بێ شعووری ڕزگاربووە و لەخۆشیان خەریکە هەڵفڕێ. هەروەها بە سەربەخۆیی و بڕوابەخۆیی گەیشتووە بەجۆرێك کە «ئەنجومەنی زەویی تەخت »ی لە شارەکەی کردۆتەوە و سەرەڕای ئەوانە خەریکی وەڕێ خستنی کەمپەینێك بۆ ڕزگاری پلاتیپووسەکانی ئەیالەتی کۆنتاکی ئەمریکایە.

٤ ـ گرفت لە قسەکردندا: زۆرینەی ئەو مندالّانە لە گەورە ساڵیشدا وەکوو مندالّ قسە دەکەن. بەڵام بە ڕەوش و دەرمانی نوێ دەتوانن فێربن و

ڕستەی وەك «بەچاوان» و «تکات لێ دەکەم لەوە بەولاوە لێم مەدە» بەکار ببەن. جاری وایە لەوە زیاتر دەزانن و هەراوهوریا سازدەکەن.

٥ ـ گرفت لە پێکەنین دا: هێندێك لەو داماوانە لە ئاقارێکی ساردو سڕ گەورە بوون و پێیان وایە پێکەنین کارێکی شێتانەیە. دەرمانکارەکان بۆ چارەسەریان دەورەیەکی سێ مانگە دادەنێن کە دیتنی فیلمەکانی چارلی چاپلین و پێکەنینی بۆ ماوەی دوازدە سەعات لە ڕۆژدا لەخۆ دەگرێ. زیاتر لە ٩٥ لە سەدی ئەو کەسانەی ئەم دەورەیە تێپەڕ دەکەن دەتوانن قاقا لێ بدەن. هەڵبەت ئەگەر کەسێك دەست بە گۆچان بگرێ و گەلا وگەڵ بڕوا.

٦ـ ئاریشەیی خۆخاڵی کردن: ڕەنگە پێتان سەیر بێ، بەڵام ئەو منداڵانەی دایك و بابی بێ شعووریان هەیە هەست و ئیحساسیان ڕادەگرن و تەنانەت لە گەورە ساڵیشدا ئەم خووخدەیە وەلانانێن. بە ڕەوانکاریش چارە ناکرێن. دەبێ دووبارە شێوەی دانیشتن لە مستەراحیان فێر بکەین. هێندێك لە دەرمانکارەکان بۆ چارەسەریی ئەم کێشەیە لە هیپنۆتیزم کەڵك وەردەگرن. ئەوان پێیان وایە تەلقین دەکەن کە ئەم کارە بۆخۆیان باشە و پەیوەندی بە دایك و بابیانەوە نییە.

٧ ـ گرفت لە هێمنایەتی بیرو زەین دا: ئەو منداڵانە چونکە ناچاربوون لە بەرانبەر لۆمە و توانجەکان دا بەرگری بکەن، کاتێك گەورە دەبن زۆر دەمارگرژ و پەشێون. ئەوان لە دواییدا تێدەگەن دوژمنیان نییە. (جگە لە دایك و بابیان) و هێور دەبنەوە. دەبێ ئەوەش لە بەرچاو بگرین مادام

گەورە ساڵن دەبێ بەسەر کێشەکاندا زاڵ بن. ئەوان لەگەڵ دایک و باببیان نین و بە دەگمەن دەیانبینن، بەڵام هەر بەو هۆیە پێویستیان بە دەرمانکردن هەیە. ئەگەر دەرمان نەکرێن، ئارەزووی دایک و بابی ئاقڵ لە مێشکیاندا دەمێنێتەوە. بۆیە بەو منداڵانەی دایک و بابی بێ شعووریان هەیە، پێشنیار دەکەم کە ئەم بابەتانەی خوارەوە لە بەرچاو بگرن و لە ماوەی دەرمانکردندا ئەنجامی بدەن:

*لەگەڵ دایک و بابتان ئاشت ببنەوە. سەردانیان بکەن و پێیانبڵێن تەواوی گێرەو کێشەکانی ڕابردوو فەرامۆش دەکەین. بڵێن ڕابردووەکان تێپەڕ بوون، ئەگەر دەتانهەوێ لە میرات بێ بەش نەبن باسی بێ شعوورییەکانیان مەکەن.

*بیر لەو خووخدانە بکەنەوە کە لە دایک و بابتان وەرتان گرتووە. ئەگەر بێ شعوورییە وەلای نێن و ئاکاری باشی لەجێ دابنێن.

*دایک و بابتان فەرامۆش بکەن. بەشێک لە میراتەکەتان بدەن بە ئەنجومەنی چاکسازی و پاک کردنەوەی بێ شعوورەکان. هەنگاوی بەرزیان بۆ دیاری کردن و چارەسەری ئەو منداڵانە هەڵێناوە و ئەگەر ئێوە یەکێک لەوانەن، ئەوا هاودەردی خۆتان بدۆزنەوە و پێکەوە گرووپێکی دەرمانی پێک بهێنن. هەروەها دەتوانن کتێبی پڕبایەخی «خراپترین باوکی دنیا» بەرهەمی کریس ئافۆرد بخوێنەوە».

## چالاکییەکان

١ ـ ئاخۆ ئێوەش قوربانی دایك و بابی بێ شعوور بوون؟ چۆنتان زانی؟

٢ ـ چۆن ئەم بابەتە لە سەر ژیانتان کاریگەری داناوە؟

٣ ـ کەی دەتانهەوێ گەورە بن؟

## بابەتی بیست و سێهەم:

## قۆناغەکانی چارەسەری

«شێتیی مانگا بنەبڕ بکەن مانگاکانی دیکە دەمێننەوە»

بێن . بێ شعوورێك کە خەریکی چارەسەرییە

دژوارترین قۆناغی دەرمان کردن قۆناغی یەکەمە، یانی قەبووڵ کردنی بێ شعووریی. هیچ کەس پێی خۆش نییە بێ شعووربێ و کەوایە نێپەرکردنی هەنگاوی یەکەم ئازاردەرە. کاتێك کە پێویستی بە بوێریی و ئیرادەیە.

لێرەدا بەهۆی ئەو ئازار و برینانەی پێی گەیشتووە. سیستەمی بەرگری بێ شعوور لاواز بووە. ئیدی هێنانەوەی بەڵگەی ناڕاست، لێبووردن، تاوانخستنە ئەستۆی کەسێکی تر، هات و هاوار، درۆکردن و بۆڵەبۆڵ کردن داخوازی بێ شعوور بەجێ ناهێنن. تەنیا چارەسەری ئەم بابەتە ئەوەیە کە ڕاستییەکان بڵێین و بێ شعوور لەگەڵ خۆی ڕووبەڕوو بێتەوە: ئەو بێ شعوورە!

ئەگەر گەیشتن بە قۆناغی دۆزینەوەی ڕاستی، ڕاستەقینە و ئاسایی بێ، ئازادی و خۆشحاڵی لە دەروونی بێ شعووردا دەبزوێ. گەیشتن بەم قۆناغە دژوارە بەداخەوە ئەندامانی بنەماڵە، هاوکار و هەڤاڵان ئەوە لە بەرچاو ناگرن ئەوان بێ ئەوەی بیر لە ئاکار و ڕەفتاری بێ شعوور بکەنەوە، دەڵێن «تۆ بێ شعووریی». بەڵام ئەوان گوێچکەیەکیان دەرگایە و ئەوەی تریان

دەروازەیە و دەڵێن: دەرگاکە پێوەدە)). هەر ئەوشتەی لە ڕەوان پزیشکی‌دا بە حاشاکردن ناوی دەبەن. نە تەنیا بۆ بێ شعوورەکان بەڵکوو بۆ دەرمانی تەواوی تووشبوەکان، گەورەترین ئاستەنگی بەهەژماردێ. تەنانەت ڕەفتاریان بۆ دەوروپشتیان ڕوون و ئاشکرابێ، دیسان لە ڕاستییەکان لادەدەن. ئەوان بەم وەلاّمانە حەول دەدەن ڕاستییەکان بشارنەوە: ((تەنیا ڕواڵەتی کارەکانم وەکوو بێ شعوورەکانە)). ((لەتۆ بێ شعوورتر نیم)). ((بێ دین پێی وایە هەمووکەسێك ((کافرە)). ((هەر ئەوەیە)). ((پێویستم بە دەرمان نییە، بۆخۆم چارەی دەکەم)). ئەگەر منت خۆش‌دەوێ لەسەرخۆبە)). دەبێ دەسبەجێ کارەکانی دەست پێ بکا، نەوەکوو خووخدەی قەدیمی و سەرکۆنە کردنی هەڵەسوون بێنێتەوە. دەبێ خۆی بناسێتەوە. دەبێ لە بەرانبەر ئاوێنەدا ڕاوەستێ و هاوار بکا ((بۆ لەگەڵ خۆشەویستترین کەس ((یانی خۆم)) ئەم کارەم کرد؟ چۆن توانیم ئەوەندە زاڵم و چەوسێنەر بم؟ چۆن توانیم ئەوەندە گەمژەبم.؟ بۆ؟ بۆ؟))

سەبارەت بە خۆم دەبێ بڵێم کە پێشینەی پزیشکی و ئەزموونەکانی کۆمناسی هیچ پشکێکی بۆ من نییە. بێ‌شعووریی پێوەندی بە خوێندەوارییەوە نییە، پێوەندی بە ڕەفتاری مرۆڤەوە هەیە. تەنانەت هێندێك لە بێ شعوورەکان، پسپۆڕن و خەڵك ڕێنوێنی دەکەن.

من ناچاربووم ئەم سەرکەوتنە ڕواڵەتیانە تێپەڕ بکەم و وەلایان‌نێم و بە پووچ بوونی خۆم بگەم و بەو قەناعەتە گەیشتم کە سەرچاوەی بێ شعووریم بێ کاکڵی کەسایەتیمە کە وەك چاڵێك هەمووشتێك قووت دەدا.

یەکەمجار کە لەو دنیایە هاتمەدەر هەستمکرد کە لە چالاوێك دام و چەند ساڵە تێکەوتووم و نەمزانیوە و ئێستا دەمهەوێ بێمەدەرێ.

ئەم ئەزموونە لە پزیشکی دا بە «دەرکێشان» ناودێر کراوە. ئەزموونێك کە ڕاستییەکان دەردەخا. یەکێك لە نەخۆشەکانم کە بریکاربوو دەیگوت «کاتێك هەستم بە پووچ بوونی خۆم کرد دەتگوت بومەلەرزە رووی داوە. زانیم کە من و تەواوی بریکارەکان دووڕوو، ساختەچی و فێڵ بازین. هەستم کرد وەکوو زاررووی خوێن مژ وام و فریشتەی عەداڵەت ژنێکی چاو قووچاو نەبوو، بەڵکوو پیرێژنێکی قوماربار قاقای لێدەدا».

ئەگەر بێ شعوورێك بتوانێ ئەم قۆناغە سەختە تێپەڕ بکا، ئەوا دەتوانێ قۆناغی دەرمان یانی پەشیمانی دەست پێبکا. حەزو تاسەی چاکسازی، بێ شعوور ناچار دەکا دووری لەو کارە ناحەزانە بکا کە چەند ساڵە کەڵکە بوون. خووخدەی وەکوو لەخۆبایی، سووکایەتی، سەرسوالکەری، خراپەخوازی، تووڕەیی و بەدگومانی.

دیارە ئەم کارە قورسانە، بێ شعوور لاواز و بێ چارە دەکا. ئەو هێزانەی پاڵپشتی بوون (لەخۆبایی، درۆزنی، ساختەچێتی) بایەخی خۆیان لەدەست دەدەن. ویژدانی لە خەو هەڵدەستێ وهەست بە پەشیمانی، گوناح و تەنانەت هاوخەمی دەکا. ئەم بارودۆخە دژوارترین بارودۆخی بێ شعوورە. چونکە خەریکە دەبێتە بەشەر! سەردەمی ترس و دوودڵی بەسەر دەچێ. ئەگەر لەم قۆناغەدا، دۆستان و دەرمانکارەکان پشتیوانی لە بێ شعوور نەکەن، لەوانەیە ڕەوتی دەرمان لەناو بچێ. بەو حاڵەش بێ شعوور

دەتوانن بە بوێری، ئاوەزی، شانس و یارمەتی خودا و دۆستان بەسەر ئەم کەمایەسییەدا زاڵ بێ. ئەوجار دەبێ بۆ قۆناغی چوارەمی دەرمان ئامادەبێ. لەم قۆناغەدا دەبێ خووخدەی باشی ئینسانی، کە پێشتر لەگەڵی نامۆ بوو، پێك بێ. لەم قۆناغەدا فێردەبێ کە:

*هاوکارو هاودەمی خەڵك بێ.

*دەسەڵات دابەش بکا.

*بەسەرکەوتنی خەڵك خۆشحاڵ بێ.

*هەڵەکانی بەئەستۆ بگرێ.

*باوەڕی بە خەڵك بێ.

*ئیجازە بدات خەڵك بیر و باوەڕی خۆیان هەبێ.

*دڵسۆز بێ.

بێ شعوور تازە چارەسەرکراو تێ دەگا کە بەزین و دۆڕاندن لە ژیاندا هەیە و هیچی لەگەڵ ناکرێ. ئەگەر خەڵکیش لە دەسەلاتدا بەشیان هەبێ کێشە دروست نابێ و دەزانن کە ئەنجامدانی کارەکان بەبێ بەرنامە و ستراتیژی چەندە خۆشە. هەروەها فێردەبێ کە چۆن لەگەڵ بێ شعوورەکانی دیکە ڕەفتار بکا. چونکە وردە وردە لە ناوەڕۆکی بێ شعووربوونی خۆی دەگا و ئێستا دەزانێ کە ئەو دۆست و هەڤاڵانەی چەند مانگ لەوە پێش بە بێ شعوور ناویان دەبرد، بۆخۆیان شایانی ئەو وشەیەن.

قۆناغی کۆتایی قەت کۆتایی نایێ. بێ شعوورێك کە ئێستا خەریکی دەرمانکردنە، دەبێ ئەوەی لە بیر نەچێ کە ڕۆژگارێك بێ شعوور بووە و

ئەگەر ئاگای لە خۆی نەبێ، لەوانەیە دیسان بێ‌شعوور بێتەوە. نابێ بەردەوام چاوەڕێی یارمەتی خەڵك بن و دەبێ بۆخۆی ڕیشەی کێشەکان ڕشك بکا دەبێ ئاقڵ بێ و ئاقڵ بمێنێتەوە.

ئامانجی دەرمان کردن: ئینسانبوون و ئاقڵ بوونە. هەر ئەوەی کە مرۆڤ شعوور، کەسایەتی و ڕەفتاری باش و ژیرانەی هەبێ، تەواوە. بەقەولی سالی یەکێك لەو بێ‌شعوورانەی ئێستا خەریکی تێپەڕکردنی قۆناغەکانی چارەسەرییە! «هەر ئەوەی کە: همین کە سرش با تهش بازی نکند بە یک دنیا می ارزد».

چالاکییەکان:

١ - هەتاکەی حاشات لە ڕاستییەکان کرد. ئاخری قەبووڵت کرد بێ شعووری؟

٢ - چەند کەس لە مرۆڤە عاقڵەکان دەناسی؟ تایبەتمەندی ئاسایی ئەوان چییە؟

## بابەتی بیست و چوارەم:

## کەرەستەی دەرمان کردن

«من بێ شعوورم و گرینگ نییە
ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ باشتر دەبم و خەمم نییە
ئێستا خەریکی دەرمانکردنم تا بتوانم
لەگەڵ مرۆڤەکان هەڵس وکەوت بکەم»
گۆرانی گرووپێکی دەرمان

گیرۆدە بووانی مادەی سڕکەر، ئەلکۆلی و سیگاری دەتوانن گیرۆدەیی خۆیان وەلانێن، بەڵام بێ شعوورەکان ناتوانن. بێ شعوور نەدەتوانێ ڕەفتاری بگۆڕێ نەکەسایەتی. چارەسەری تەنیا لە بوێریی، تێکۆشان و بەختەوەری کورت نابێتەوە. بێ شعوور دەبێ پاقژبێ، دووبارە بەرنامە داڕێژێتەوە و دووبارە دەستبەکار بکاتەوە. دەبێ لەخۆیایی ببێتە بێ دەماری. بێحەیایی ببێتە ماقووڵی و لەسەرخۆیی. پەستو خوێڕی جێگای بە گەورەیی بدا و تووڕە ببێتە دلۆڤانی و خۆشەویستی. هیچکام لەوانە مسۆگەر نابێ مەگین بێ شعوور بۆ چارەسەریی کەرەستەی پێویستی هەبێ، یانی کارامەیی و لێهاتوویی بۆ گۆڕینی خووخدەی ناحەز بە تایبەتمەندی ئینسانی.

لێرەدا ئاماژە بە پێنج دەرمان و کەرەستە دەکەین و بێ شعوور دەتوانێ کەڵکیان لێ وەرگرێ. هەرکام لەوانە لە ڕەوتی دەرمان کردندا ڕۆڵی خۆیان

هەیە و بێ شعوور دەتوانێ بەکاریان ببا و ببێتەوە ئینسان. ئەم پێنج کەرەستەیە شرۆڤە دەکەین.

## دەرمانی گرووپی:

دەرمانی گرووپی بەردی بناغەی ڕەوان دەرمانییە. بۆ چارەسەری بێ شعوور، لە قۆناغی یەکەمدا، بێ شعوور لە هەموو کاتەکان کەرترە و بە ئاسانی دەگەڕێتەوە دۆخەکەی جاران. دەرمانی گرووپی یارمەتی دەدا خۆی بپارێزێ و وەبیری دەهێنێتەوە کە لە کاری بێ شعوورانە دووری بکا. لەم کۆبوونەوەیەدا ناتوانێ درێژە بە درۆ و گەنەکارییەکانی بدا، چوونکە دەوروپشتی لە خۆی بێ شعوورترن.

جگە لەوانە، کاتێك چاو لە نەخۆشەکانی دیکەی گرووپەکە دەکا لەبەرخۆیەوە دەڵێ «ئەوانە کێن؟ پێم خۆش نییە وەك ئەوان بم» دواتر بۆخۆشی تێ دەگا کە یەکێك لەو بێ شعوورانەیە. بەڕاستی بێ شعوورە! ئەم بابەتە وای لێدەکا کە لێ بڕاوانە بۆ چاکسازی خۆی هەوڵ بدا.

## دەرمانی تاکی:

دەرمانی بێ شعووریی بە شێوەی تاکیش بەڕێوە دەچێ، بەومەرجەی دەرمانکار بۆ چارەسەری مرۆڤی کەڵەکباز، دەورەی پسپۆڕی تێپەڕ کردبێ. هەڵبەت جاری وایە پێویستی بە شێوازی نوێیە. بۆ وێنە، بێ‌شعوورێکی تووڕە وەکوو بەرمیلێك بارووت وایە کە بە چەخماخەیەك

دەتەقێتەوە و واباشە دەرمان کردنی لە گۆڕەپانێکی مینڕێژیکراو یان شوێنی تەقینەوە بێ.

## شۆک دەرمانی:

هێندێك لە بێشعوورەکان لە بەرانبەر دەرمانی ئاسایی‌دا بەربەرەکانێ دەکەن. بۆ گەڕانەوەی شعووریان پێویستییان بە ڕاچڵەکاندنە. هەڵبەت شۆکی کارەبایی نا، بەڵکوو «دەرمان بە شۆکی ڕەوانی». چەند فاکت سەبارەت بەم بابەتە:

*ئەگەر لەگەڵ بێ شعوورێك سەروکارتان هەیە کە بۆ ئاقڵ بوونی خۆی حەول نادا، بیخە ژێردەستی کەسێك کە لە خۆی بێ شعوورترە. بەمکارە ڕادەچڵەکێ و سەبارەت بە بێ دەماری، پشوودرێژی، خۆڕاگری و بەرپرسایەتی وانە وەردەگرێ.

*باشترین شت بۆ شۆك دەرمانی بێ شعوور ئەوەیە کە پیشەیەکی لەباریان بۆ پەیدا بکەن. ئەگەر لە پیشەسازی یان شیرکەتی خاوێن کردنەوەی شەوانە دابێ، باشترە. ئەم کارە دەرفەتێکە بۆ بنەماڵە کە پشوو بدەن و یارمەتی بێ شعوور دەدا کە سەربەخۆ بێ.

*فاکتێکی دیکە بۆ شۆك‌دەرمانی، سەردانی پەرستگا یان خانەقا و نەزرکردن بۆ شەش مانگ بێ دەنگی و دوورە پەرێزی. ئەم کارە یارمەتی دەدا بیر بکاتەوە.

*فیلمێك لە ژیانی ئاسایی بێ شعوور و هەراوهوریا سازکردنی ئەو تۆمار بکەن و ناچاری بکەن ڕۆژی دە ساعەت چاوی لێ بکا. بەڵکوو بەخۆیدا بێتەوە و دان بە ئازاردانی خەڵکدا بهێنێ.

*بۆ بینینی دەورەی نیزامی، بێ شعوور ببەنە ژێر دەستی کەڵە بێ شعوورێك هەتا بزانێ زۆرە ملی، لاساری، گوێ نەدان و شەق خۆشە.

ئەگەر ئەم ڕێگە چارانە سەرکەوتوو نەبوون، ئەوا لەگەڵ بێ شعوورێك سەروکارتان هەیە کە بۆ دەرمان کردن ئامادە نییە و کەس ناتوانێ یارمەتی بدا. کەوایە کارێك کە دەکرێ ئەوەیە کە: بۆ کارێك هانی بدەین کە بێ شعووریی لەو کارەدا سەرتری و گەورەیی بەهەژمار دێت. کارەکانی وەك ئامۆژگاری دینی، بریکاری و بەراوردیماڵیات.

ئەنجومەنی بێ شعوورە ناسراوەکان

واباشە لە قۆناغی دووهەمی دەرمان کردنەوە هانیان بدەین کە پەیوەندی لەگەڵ ئەنجومەنێك بگرن. ئەم ئەنجومەنانە، بە ئەنجومەنی بێ شعوورە ناسراوەکان (Anonymous Leagues _ Assholes Non) یان: یەی. ئێن. ئەی. ئێل. ناودێر کراوە. ئەوانە وەك گیرۆدەیەکی نەناسراون، بەڵام بەو جیاوازییە کە نابێ نەناسراو بن. کەسێك کە گیرۆدەی ئەلکهولە، سروشتییە کە نایهەوێ ناوەکەی ئاشکرا بێ. بەڵام مرۆڤی بێ شعوور لەمێژە بە نهێنکاری و کەڵەکبازی خۆی شاردۆتەوە. کەوایە دەبێ ئەندامانی هەرکام لەو ئەنجومەنانە لە گۆڤارێکی ناوچەیی دا بێ شعووریی خۆیان ڕابگەیەنن:

«بەم هۆیە. من.......... بێ شعووریی خۆم ڕادەگەیەنم. لە بەر ئەو ئازار و مەینەتیانەی بە هاووڵاتیانم گەیاندووە داوای لێبووردن دەکەم و بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم زەرەرو زیانانە داوای یارمەتیتان لێ دەکەم، بەڵکوو ئاقڵ بم».

لەم ئەنجومەنەدا. ئەندامەکان فێردەبن لە بەرچاوی خەڵك خووخدەی ڕابردوویان کە شەڕو هەرا لەگەڵ خەڵك، نەناسینی ئەرك، تاوانبارکردن و چەوساندنەوە بوو، ئاشکرا بکەن. بە کورتی ئەم ئەنجومەنانە گیان پەنایەکە بۆ بێ شعوورەکان. تا بتوانن کێشەکانیان چارەسەر بکەن و لەژێر پشتیوانی و چاوەدێری گشتی دا بن.

قۆناغەکانی کردەوەیی ئەم ئەنجومەنانە لە کتێبی ڕێنوێنی بێ شعوورە ناسراوەکاندا هاتووە. لەم کتێبەدا لە سەر قەدەغە بوونی دوو کردەوە لە کۆبوونەوەکاندا پێداگری دەکا: بۆڵە بۆڵ کردن و تاوانبارکردنی خەڵك. هەموو بێ شعوورەکان عادەتیان بەم دوو کردەوەیە کردووە. کەوایە ئەگەر بێ شعوورێك پاقژ بووە و بۆڵەبوڵی کرد و خەڵکی تاوانبار کرد، دەسبەجێ وشیاری بکەنەوە و بڵێن: «هەر ئەوەیە.... هەرئەوەیە».

کاتێك بێ شعوورەکان لەم کۆبوونەوانەدا بەشداری بکەن و بڵێن ساڵێکە لە نەخۆشی بێ شعووریی پاك بووینەتەوە، ئەوا جەژنی بۆ بگرن و لەوحی «پاقژ و باشعووریی» پێبدەن.

## بەرنامەی دوازدە قۆناغی:

بەرنامەی وەلانانی دوازدە قۆناغی کە لە سەرەتاوە بۆ دەرمانی مەشرووب خۆرەکان سازکراوە دواتر بۆ وەلانانی مادەی سڕکەر، زۆرخۆری و قومارچی بەکار براوە. ئەم ڕەوشە بۆ چارەسەری بێ شعووریش دەبێ، بەلام دەبێ بە وردبینییەوە کەلکی لێ وەرگرن. ئێستا ئەم دوازدە قۆناغە شرۆڤە دەکەین:

١ ـ قەبوولی بکەن کە وەکوو بێ شعوورەکان ڕەفتار دەکەن و ئێستاکە هێزی ئەوتان نییە کە بەسەریدا زال بن، بۆیە ژیانتان لە خۆتان و دەوروپشتان تال کردووە.

٢ ـ قەبوولی بکەن هێزێکی سەرتر هەیە کە مرۆڤەکانی بۆ ڕزگاری ئافراندووە.

٣ ـ پرتەو بۆڵە وەلانێن تا هێزی سەرتر بتوانێ لە بێ شعووریی ڕزگارتان بکات.

٤ ـ بە بێ ترس و دڵەڕاوکێ، پێڕستێك لە کارە باش و خراپەکەت ئامادە بکە، لە جەنایەتی دژی بەشەرەوە هەتا کارە باشەکان. ئەمە وێنەی سامناکی ئێوەیە.

٥ ـ دان بەو ئازارانەدا بهێنن کە بە خەڵکتان گەیاندووە. ئەم ئاشکراکردنەوە لە بەرانبەر خودا، ویژدانی خۆتان، مرۆڤێکی ئاقڵ یان هەرکەسێك کە گوێ بۆ قسەکانتان شل دەکا، ئەنجام بدەن.

٦ ـ بۆ پاقژکردنەوەی بێ شعووریی نەزر بکەن و بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە لە هێزی سەرتر یارمەتی وەگرن.

٧ ـ سەبارەت بە بێ شعووریی خۆتان، ئەوەندە مەلێن شەرمەندەم و ببوورە. جۆرێك ڕەفتار بکەن کە ئەننەهوو ئاقڵ و بەشعوورن. تەڵقین بکەن.

٨ ـ پێرستێك لەو کەسانە ئامادە بکە کە زۆرت لێ کردوون، ئاوڕت لێ نەداونەتەوە، وەکوو کۆیلەیەك ڕەفتارت لەگەڵ کردوون. حەول بدەن هەموویان قەرەبوو بکەنەوە.

٩ ـ داوای لێبووردن لە تەواوی ئەوکەسانە بکە کە ناویان لە پێرستێکدا نووسراوە.

١٠ ـ ڕەفتاری ڕۆژانەتان هەڵسەنگێنن. ئەگەر هەڵەی تێدابوو، دەسبەجێ قەبووڵی بکەن.

١١ ـ بە هەر شێوەیەك کە بۆتاندەکرێ، لە دوعا و نیایشکردن تامێدیتیشێن (ئەندێشە) و زکەخشکە، حەول بدەن لەگەڵ هێزی سەرتر پەیوەندی بگرن.

١٢ ـ ئەگەر ئەم ڕەوشە بەکەڵك هات و چاك بوونەوە، ئەوا بە کردەوە و ڕەفتاری خۆتان بێ شعوورەکانی دیکە حاڵی بکەن و نیشانیان بدەن و وەکوو مرۆڤەکان درێژە بە ژیانتان بدەن.

ئەم بەرنامەیە بە تەنیایی یان لەژێر چاوەدێری دەرمانکار ئەنجام دەدرێ. دەرمانکار یارمەتیتان دەدا بەسەر لەخۆبایی بوونتاندا زاڵ بن. بەتایبەت

سەبارەت بە ژمارە چوار کە پێڕستێك لـە خـاڵی لاواز و بـەهێزە و لێـرەدا دەرمانکاری پیشەی کاریگەری خۆی نیشان دەدا.

زۆرێك لە بێ شعوورەکان دەتوانن بە تەنیایی خاڵە لاوازەکانیان چارەسەر بکەن، بـەڵام هـەژمارێکی کـەم دەتـوانن تایبەتمەنـدی ئینسانی بەدەست بهێـنن. دڵسـۆزی فـاکتێکی باشـە. ئەمـە تایبەتمەندییـەکی باشـە کـە بێ شعوور (ئێستا خەریکی چارەسەرییە) دەتوانێ لە دەروونیدا پەروەردەی بکات، بەڵام بێشعوور پێی وایە دڵسۆزی نیشـانەی لاوازی و تەوەزلییـە. کەوایە دەبێ بە تەواوی سەبارەت بە ژیـان، بۆچوونتان بگۆڕن. زۆربـەیان خودایان لە بیر چۆتەوە. ویژدانیان خنکانـدووە و دۆستـەکانیان لـە خۆیـان تاراندووە. کەوایە سروشتییە کە ناتوانن دووبارە لەگەڵ دۆستان، ویـژدان و خودا پێوەندی بەرقەرار بکەنەوە.

پاقژکردنی ڕاستـەقینەی ئاکـاری بـێ شـعوورانە و لـەجێ دانـانی شـتی چاکتر، ڕەوتێکی درێژخایەن و دژوارە. ئەم پرۆسەیە وەکوو ڕۆژووگرتنە بەو جیاوازییەی کە لێرەدا دووری لە ئاکاری بێ شعوورانە دەکەی. بۆ وێنـە ـ بـێ حـەیایی لـە بەرچـاو بگـرن و حەوتوویـەك دووری لـێ بکـەن. دواتـر عادەتێکی دیکە وەکوو قینەونی لە بەرچاو بگرن و حەوت ڕۆژ دووری لـێ بکەن.

ئامـانجی ئـەم دەرمانـە، ڕاگـرتن و وەلانـانی ئـەم ئاکـار و عـادەتانەیـە. لەوانەیە بۆ ئەم مەبەستە ناچاربن لە هێندێك ئـاواتی دێرینـەتان پاشـگەز بن، ئامانجێك وەك براوەبوون و گاڵتەکردن بە ئابرووی خەڵك.

سروشتییە کە ئەم ئاکارو عادەتانە لە هەر قۆناغێکدا سەرهەڵدەنەوە. ئەگەر شۆکێکی کارەبایی لە خۆتان بدەن. ئەگەر لە ڕۆژوگرتن و دووری‌کردن لە ئاکارە خراپەکان سەرکەوتوو بوون. ئەوا تایبەتمەندی پۆزیتیڤ، ڕاستبێژی، یارمەتی خەڵك، ئەمەگداری، ڕەفتاری دۆستانە و دڵگەرم‌کردنی خەڵك لە بەرچاو بگرن. دواتر حەوتوویەك لە سەر تایبەتمەندییەك کار بکەن.

ئەوانە کەرەستەیەکن کە دەتوانن بۆ چارەسەری بێ شعووریی بەکاری ببەن. هیچ کامیان سێحراوی نین. بەکاری خۆیان دێن ئەگەر بەکاریان ببەن و لە بەکاربردنیان دا بەدەمار نەبن. دەرمانی خۆتان و دەوروپشتتان دەست پێبکەن. جگە لەوە دەرمانی دیکەی نییە.

چالاکییەکان

١ ـ ئاخۆ تا ئێستا بێ شعووریی خۆتان بەکەس گوتووە؟ نا، کەوایە ئاگادارییەك بنووسن و لە تابلۆی ئاگاداری کارەکەتانی بدەن. لە بیرتان نەچێ ناوی خۆتان بنووسن و واژۆی بکەن.

٢ـ لەگەڵ «ئەنجومەنی بێ شعوورە ناسراوەکان» پێوەندی بگرن. ئەگەر وەها گرووپێك لە گەڕەکی ئێوە پێك نەهاتووە، دروستی بکەن.

## پەیڤی کۆتایی

«ئێستا نازانم کێم. بەڵام هەرچی بێ ئیدی بێ شعوور نیم».

نێل . بێ شعوورێك كە پاقژ بووەتەوە.

بە درێژایی مێژوو، بۆ چاکسازی بێشعوورەکان ڕێگەچارەی جۆراوجۆر بەکار بردراوە. لە سەردەمی کەونارادا، بێ شعووریی داماویان وەك کۆیلە دەفرۆشت، یان لە گەمییە سەوڵییەکاندا کاریان پێ دەکردن. ملی بێ شعووری شەش دانگیان دەپەڕاند یان زیندەبەچاڵیان دەکرد. لە سەدە ناوینەکاندا لە سەر سەلیب بە زیندوویی دەیان سووتاند (ئەم بۆچوونە کە ئەوانەی لە سەر سەلیب سووتان ژنانی جادوو باز بوون، هەڵەیە. هێندێك لەوانەی بێ شعووری شەشدانگ بوون کە لەوپەڕی لاپرەسەنی و سەربزێویدا لە خەرمانی گوێنی نزیك بوونەوە و ئاخری ئاوریان تێ بەربوو).

ڕەگەڵ پێشکەوتنی بەشەر، ئەم ڕەفتارانەش ئینسانی و مرۆڤانە بوو. پێوریتینەکان تەنافیان لە ملی بێ شعوورەکان دەهاڵاند و یەك لەدوای یەك لە چۆمیان دەهاویشتن و دەیانهێنانەوە دەرێ. دواتر خوێن مژیان دەخستە جەستەیانەوە. ماوەیەك ناچاریان دەکردن کە لە نیشانەی سوور کەڵك وەرگرن و پیتی A کە تایبەت بە بێ شعوور (Asshole) بوو بە لیباسەکانیانەوە بچەسپێنن. سزایەك کە دواتر بۆ داوێن پیسەکان دانرا .

ئەم ڕێگە چارانە تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەلام ڕووداوی سامناکیشی بەدواوەیە. بەختەوەرانە ڕەوانناسی مۆدێرن توانایی بە ئێمە داوە تا بۆ چارەسەریی بێ شعوورەکان لە دوایین دەسکەوتی ڕەوان دەرمانی کەلك وەرگرین.

هەڵبەت ئێستاش کێشەو هەرای دەرمانی زۆرە. زۆرێك لەو کەسانەی کە بۆخۆیان دەرمانی بێ شعووریان تاقی نەکردۆتەوە ناتوانن لەوە حالی بن کە بێ شعوورێك (لەژێر چاوەدێری دەرمانی) چەند ئازار دەچێژێ هەتا بتوانن ویژدان، هەستی پەشیمانی، هەستی هاوخەمی لەگەل خەلك و پێداویستی باشتربوون لە خۆیاندا زیندوو بکەنەوە.

ئەو بێ شعوورانەی خەریکی چارەسەریی خۆیانن، گۆڕانکاری بنەڕەتی لە شوناس، فەرهەنگ و ڕەفتاری خۆیان تاقی دەکەنەوە و زانیاری بەدەست دەهێنن. زۆرێك لەوانە لەو پرۆسەیەدا دۆست و تەنانەت کاریان لەکیس داوە. بنەماڵەکەیان گێژ بوون، هەتا ماوەیەك کەس نازانێ ئەوانە کێن، تەنانەت بۆخۆشیان.

خۆڕاگری لە بەرانبەر ئەو سەر لێشێواوییە دژوارە، بەلام دەبێ بێ شعوور بۆ چارەسەری تاقەتی لەوە زیاتر بێ. ئەو دەبێ هێز و توانایی خۆی زیاد بکا کە بەبێ درۆ، ئازاری خەلك و فێلّو تەڵەکە ژیوار بکا. لە خانووی خۆپەرەستی و لووتبەرزی بێتەدەر و وەکوو مرۆڤەکانی (ئاسایی) دیکە کار بکات. مێهرەبان و یارمەتیدەر بێ، نەك تاوانەکانی بخاتە ئەستۆی کەسێکی تر و خۆی ڕزگار بکا. تەنانەت دەبێ پێکەنینێك کە بۆنی

گاڵتەپێکردنی لێوەدێ وەلانێ و چاوپۆشی لە جەفەنگ و خۆشییەکەی بکا. ئەو دەبێ لە بەرانبەر ئەمدۆخە دژوارەدا خۆڕاگر بێ.

ژیانی بێ شعوورێك کە خەریکی چارەسەرییە، بەربەرەکانێیەکی هەمیشەییە لە بەرانبەر گەڕانەوەی بێ شعووریدا. ئەو دەبێ فێربێ کە بەردەوام بیر لە تاوان و پەشیمانی نەکاتەوە و ئەگەر ناتوانێ ئەوا لەگەڵ کێشەو تەنگ و چەڵەمەکانی ژیان بەربەرەکانێ بکا، هەڵبەت بەبێ درۆ و خەڵك فریودان.

بەڵام خۆشی و لەززەتی ئاقڵ و بەئاوەزبوون ئەوەندە زۆرە کە ئەو دەردو مەینەتیانە لە بەرانبەریدا هیچ نین. ئەندام بوون لە کۆمەڵێك کە تایبەتمەندی وەك بڕواپێکردن، هەستی هاوکاری، بەرپرسایەتی و وەفاداری تێدایە پشك بە هەژمار دێ نەك سووکایەتی و گاڵتە، هەروەها بێشعوور (ئەوانەی ئێستە خەریکی دەرمان کردنن) هان دەدا کە لەحاند دەرمانەکان خۆڕاگر بێ و درێژە بە ڕەوتی پاقژبوونەوەی خۆی بدا.

من دەمویست لە ساڵانی پێشوودا ئەم کتێبە بنووسم، بەڵام بۆخۆم پاك نەبوومەوە و خۆشحاڵم کە ئەو کارەم نەکرد. ئەگەر ئەودەم نووسیبام، نەدەبووە ڕێنوێنییەك بۆ بێ شعوورەکانی دنیا، بەڵکوو لە باشترین حاڵەتدا دەبووە بیرەوەرییەکی ڕاستەقینە لە ژیانی گەمژانەی خۆم دا.

ڕاستییەکی تاڵە کە بۆگەنیویی بێ شعووری تەواوی دنیای داگرتووە و ئەگەر بۆ خاوێنکردنەوەی حەول نەدەین، تووشی کارەساتێك دەبین

کارەساتەکە دەگاتە ئاستێك کە ئیدی لە بەر دووپات بوونەوە و هۆگرەتی،
هەستی پیێ ناکەین.
هەست بە بۆنێك ناکەن؟

کا
کەس